


# بەگاورکردن

## لە وڵاتە ئیسلامییەکاندا

### ئامانجەکانی - گۆڕەپانەکانی - کاریگەریەکانی

نووسینی

دکتور محمد بن ناصر الشپری

وەرگێرانی

یوسف نوری محمدامین

2015 1437

# بەگاورکردن

## لە وڵاتە ئیسلامییەکاندا

ئامانجەکانی – کۆڕەپانەکانی – کاریگەریەکانی

نووسینی

دکتۆر محمد بن ناصر الشثری

وەرگێڕانی

یوسف نوری محمدامین

بەگاورکردن لە وڵاتە ئیسلامییەکاندا

ئامادەکردنی: یوسف حسین محمد

نەخشەسازی و کۆمپیوتەر: جمعە صدیق کاکە

چاپی یەکەم ٢٠١٦

# پێشەکی

خوای گەورە دەفەرموویّت : ﴿ قل يا أهل الكتاب تعالوا إلى كلمة سواء بيننا و بينكم ألا نعبد إلا الله و لا نشرك به شيئا و لا يتخذ بعضنا بعضا أربابا من دون الله ﴾ ( آل عمران ٦٤ )

{بڵێ! ئەی خاوەن کتێبە ئاسمانییەکان وەرن بۆ وەرگرتنی وتەیەك، کە هەموو پێغەمبەران و کتێبە خوداییەکان، یەك قسەن تیایدا و هیچ جیاوازیەکیان نییە، ئەویش ئەوەیە، کە عیبادەت بۆکەس نەکەین تەنیا بۆ (ألله) نەبێ و هاوەڵی بۆ دانەنێین لە پەرستندا و بەتەنیا ئەو بپەرستین، هەندێکمان هەندێکمان نەکەینە خوداو نەیانپەرستین}

سوپاس و ستایش بۆ خوای پەروەردگار و سەلات و سەلام لە سەر پێغەمبەری خواو یاوەرەکانی و شوێنکەوتووانی و ئەوانەی بەچاکی شوێنکەوتەی ڕێبازی ئەون هەتا ڕۆژی دوایی .

لەپاشان . . .

نەسرانییەکان باوەڕیان بەشتێکە، کە لەناو کتێبەکانیاندا نییە، هەندێك پەرستش و تقووسی ئایینی ئەنجام دەدەن، کە هیچ شوێنەوارێکی نییە، لە کتێبەکانیاندا، بەڵکو هیچ گونجانێکی نییە، نە لەگەڵ عەقڵ و نە لەگەڵ نەقلیشدا (مەبەست دەقی نووسراوە) .

ئێمە گرەویان لە گەڵدا دەکەین، تەحەدایان دەکەین، کە ئامازە بەو کتێبانە بدەن، کە تێیدا هاتووە فەرمانیان پێدەکات، سوجدە بۆ خاچ ببەن و سوجدە بۆ وێنەو پەیکەر ببەن، ڕووگە بگۆڕن لە (بەیتولمەقدیس)ە وە بۆ ڕۆژهەڵات و شوێنی هەڵاتنی ڕۆژ. یان پێمان نیشان بدەن، کێ داهێنراوو بیدعەی یەکشەممەی لەسەر فەرز کردوون ؟! کێ خەتەنەی هەڵوەشاندەوە ؟ کێ فرەژنی لەسەر حەرام و قەدەغەکردوون ؟ لەکام کتێبدا هاتووە و باسکراوە کە مسیح (علیه السلام)

سێ یەمی سێ خواکانە(سێ یەمی سێ یەکانە)؟یان مەسیح(علیه السلام)دابەشبووە بۆ هەردوو سرووشتی لاهووتی و ناسوتی (سروشتی خوایی و سروشتی مرۆڤ) ؟ کام کتێب وای داناوە، کەفەرمانی پاپا وەکو فەرمانی خودا وایە ؟ کێ گۆشتی بەراز و عارەقی بۆحەڵال کردوون ؟ کێ مافی ئەوەی پێداون، کە لەگوناهی خەڵکی خۆش ببن و پسوولەی بەهەشت و لێخۆشبوون، یان پسوولەی دۆزەخ و بێ بەش بوون بە خەڵك بفرۆشن ؟بۆچی خەڵك قەدەغەدەکەن لە تەفسیرو لێکدانەوەی کتێبەکانیان، لە کاتێکدا بانگەشەی ئەوە دەکەن، کەکتێبەکانیان پیرۆزە؟ لەوانەیە لەوەبترسن خەڵك ئەوەئاشکرابکەن، کە چ قسەی پڕوپوچ و چ وڕێنەیەك و چ تاریکی لەسەر تاریکییەك لەکتێبەکانیاندا هەیە ؟

زانایەکانی نەسرانی دان بەوە دادەنێن، کەئەو چوارئینجیلەی ئێستا کاری پێدەکەن، لەنێوان نزیکەی سەد ئینجیل هەڵبژێردراوە، کە لە سەدەی چوارەمی زایینی، لەناو نەسرانییەکان بڵاو ببۆوە .

هەموومان دەزانین ، کە عیسا (علیه السلام) یەك ئینجیلی هێناوە، بەلام کەموکوڕی و ناکۆکی ئەو چوار ئینجلە لەناو خۆیاندا، پچڕانی سەنەدی گێڕانەوەیان و لە ڕووی مەرجی تەواترەوە، پێویستی یان بە ئاسانترین و ساکارترین مەرجی تەواتر هەیە. ئەمەجگە لە لاوازی و بێ هێزی وشەکانی و لێلی واتاکانی، هەموو ئەمانە جەخت لەسەر قەڵپی و ساختەیی و لادان و گۆڕینی ئەو ئینجیلانە دەکەنەوە، هیچ شك و گومانی تێدانییە، کە ئەو ئینجیلانە وەکو ئەو ئینجیلە نییە، کە عیسا (علیه السلام) هێناویەتی.

## بنەماکانی نەسرانییەت

بنەماکانی نەسرانییەت پێنجن:

١- (التعمید) لەناوهەڵکێشان.

٢- (التثلیث) کردن بە سیان.

٣- کوڕ تەنێکە(بەشێکە) لکاوە بەمریم .

٤- قوربانی کردنی پیرۆز

٥- لەکۆتاییدا دانان بەقەشە .

مرۆڤی نەسرانی تەنیا ئەوەندەی بەسە، کەباوەڕ بەو پێنج بنەمایە بهێنێت، لەپاشان هەرچی دەکات بابیکات، چونکە دان پێنانی گوناه لای قەشە زامنە بۆ لێخۆشبوونی گوناهەکانی و چوونە ناوبەهەشت و شانشینی ئاسمانی، بێ لێپرسینەوەو سزادان . دان پیانان لای قەشە یەکێکە لەسەیرترین نەریت و تقووسەکانی ئەم ئاینە، چارەنووسی هەموو

نەسرانییەك بەستراوەتەوە بەھەردوولێوەكانی قەشەوە، ئەگەر بیەوێت پسولەی لێخۆشبوونی پێدەدات، یان بڕیاری بێ بەشبوون لەپسوولەی لێخۆشبوونی لەبەرامبەر دەردەكات.

ئەم گاڵتەجارییە بەشێوەیەك ڕێكخراوە، تاوای لێهات مۆدێلی فرۆشتنی پسوولەی بەھەشت بلاوبۆوە. پاپایەكان و قەشەكان بازاڕێكی بەرەواجیان دروستكردبوو، بۆفێل ودزیكردن لە خەڵكی ساویلكەو گەوج..

شانازییە بۆ ئیسلام، كە لێخۆشبوونی خوا لە مرۆڤەكان، ناوەستێتە سەر هیچ هۆكارێك لە هۆكارەكان، هەرچەندە ئەو هۆكارە گەورەش بێت. بەڵكو دەوەستێتە سەر سۆز و میھرەبانی خوا و لێخۆشبوونی خودا بۆ تەوبەكردنی مرۆڤەكان و بەتەوبەیەكی ڕستگاریانە خوای گەورە دەفەرموێت :﴿ قل یا عبادی الذین أسرفوا علی أنفسهم لاتقنطوا من رحمة الله إن الله یغفر الذنوب جمیعا إنه هو الغفور الرحیم وأنیبوا إلی ربكم وأسلموا له من قبل أن یأتیكم العذاب ثم لاتنصرون﴾ ( ألزمر ٥٣-٥٤)

واتە {ئەی موحەممەد ! بەو بەندانەم بڵێ كەزیادەڕۆییان كردووە لەسەر نەفسی خۆیان لەگوناھ كردن و بێ فەرمانی كردنی خودا: نائومێد مەبن لەڕەحمەتی خوا، خوا لە ھەموو گوناھێك خۆش دەبێ، بۆ ھەر كەسێ، كەباوەڕی ھەبێ، كەوا خوا گوناھبەخش و میھرەبانە، پێیان بڵێ ! بگەڕێنەوە بۆ لای خوای خۆتان ملی بۆ كەچ بكەن و فەرمانبەرداری بكەن بەر لەوەی سزا لە خواوە بێتەسەرتان و ئەو كاتە یارمەتیتان نەدرێ و كەس بەھاوارتانەوە نەیێت} .

ڕێنماییەكانی مەسیح (علیه السلام) بەفیڕۆ چوون لەئەنجامی خراپ سوودوەرگرتن و ئیستیغلال كردنی كەنیسە بۆئەم ڕێنماییانە، چونكە (مەسیح)(علیه السلام)یان قۆرخكرد ، هەروەكو چۆن كۆمپانیایەكی بازرگانی كەل و پەل قۆرخ دەكات . لەئەنجامدا مەسیح (علیه السلام)بووە دیلی دەستی كەنیسەكان، لە هەموو ئەمانەش خراپتر ئەو باوەڕەیانە كە عیسی (علیه السلام) چۆتە دۆزەخ و هیچ لێكدانەوەكیان بۆ ئەوە نییە، تەنیا ئەوە نەبێت لە تاریكی و خەیاڵدا دەژین.

خوای گەورە ڕاست دەفەرمووێت :

﴿ومن لم یجعل الله له نورا فما له من نور﴾ ( نور:٤٠ )

( واتە هەركەسێك خوا ڕووناكی پێ نەبەخشیبێ هیچ ڕووناكیەكی نابێت ).

پێغەمبەری خواش دەفەرمووێت (( أنا أولى الناس بعیسى بن مریم فی الدنیا و الآخرة لیس بینی و بینه نبی ، والانبیاء إخوة لعلات أمهاتهم شتی ودینهم واحد)) {بوخاری : ٦ \ ٤٧٨ ژمارە ٣٤٤٣} {موسلم : ٤ \ ١٨٣٧ ژمارە ٢٣٦٥}

ئەم فەرموودەیە (ئەبو هورەیرە )گێڕاویەتیەوە.

((من لەهەموو كەس زیاتر لە عیسای كوڕی مەریەم نزیكترم لە دونیا و دواڕۆژدا، لەنێوان من و ئەو هیچ پێغەمبەرێك نەهاتووە و پێغەمبەرانیش برای یەكترن،

لە یەكتاپرستیدا و دایكیان جیاوازە و ئاینەكانیشیان یەكە))

## بەگاورکردن و بەشەکانی :

کەنیسە گرنگی داوە بەئاراستەکرنی هەوڵەکانی بۆ بە گاورکردن لە جیهانی ئیسلامیدا بۆئەوەی ئیسلام لە دڵ و دەروونی خەڵك دەربهێنن و مەسیحییەت شوێنی بگرێتەوە . هەندێك لە گاورەکان ئەمەیان ناو ناوە ((هەڵمەت و هێرشەکانی بە گاورکردن)) . ئامانجیان ئەوەیە، کە مرۆڤی موسڵمان لە ئاینی (محمد) (صل الله علیە و سلم ) ئاینی (خوا) بگوازنەوە، بۆ رێنماییەکانی (مەسیح)، چونکە ئیسلام کاتێك لەسەدەکانی ناوەڕاست بەم شێوەیە فراوان بوو، گەشەی کرد، بەریەستێکی گەورەی لەبەردەم نەسرانییەکان دروست کردبوو، پاشان فراوان بوو ، تاگەیشتە ئەو وولاتانەی لە ژێر دەستی نەسرانییەکاندابوون و لەژێرچەکمەی مەسیحییەتدابوون .

نەسرانییەکان زانییان، کەهێرشکردنی ماددی و چەکداری بۆ سەر وولاتە موسڵمانەکان کارێکی ئاسان نییە، زانییان ئازایی و چاو نەترسی موسڵمانە پاڵەوانەکان، ئەوانەی خۆڕاگریوون لەبەرامبەر هێرشەکانی خاچپەرستی هەتا خوا پاشەکشەی بۆ نووسین، کارێکی ئاسان نییە.

تەگبیرکەرو پیلانگێڕەکانی شەڕی خاچپەرستی، جاسوس و سیخوڕەکانیان ڕەوانەی ولاتە ئیسلامیەکان کرد، جاسوس و سیخوڕەکانیان بە ولاتانی ئیسلامیدا بڵاوکردەوە، بۆ ئەوەی واقیعی ژیانی موسڵمانان بزانن و لە ناو خۆی ئەو ولاتانەدا لایەنگرو داردەستیان بۆ پەیدا بکەن، لەمەشدا تارادەیەکی زۆر سەرکەوتوو بوون و خەڵکێکی

ئـەهلی زمـە و دەسـتە و تاقمـە لـە ڕێ لادەرەكانیـان بـۆ خۆیـان ڕاكێشـا، لەسـەر ئـەم بنەمایـەش بڕیاریانـدا شـەڕ لەگـەڵ موسـڵمانان بگـۆڕن، لـە شـەڕێكی ئاشـكرای چـەكداری، بۆشـەڕێكی دەمامكـدار و ڕووپۆشـكراو، غەزووی فیكری و دەروونی و ڕەوشتی دەچێتە ناو بەرژەوەندیـەكانی ئـەم شەڕە، جا ئەگەر غەزووی فیكـری و دەروونـی تـەواوبوو، سـەركەوتووبوو، ئەوا بۆ داگیركەر ئاسان دەبێت، نێچیرەكانی واتـە ئـەو كەسانەی غـەزوی فیكری كراون وغەزوی دەروونی كراون وەكو ولاغێكی دەستەمۆ و گوێی لە مست، بەئاسانی دەتوانێـت هەرچـی بیـەوێت پێیـان بكـات و بەرامبـەریان ئـەنجامی بـدات . پیلانگێـڕان لـە كۆتاییـدا گەیشـتنە ئـەو ئەنجامـەی كەیاسـایەك بۆخۆیـان دابنـێن، ئـەویش ئەوەیـە ((ئەگـەر لـە چـەكی دوژمنەكانت ترسای، مێشك و بیری تێك بدە، تا بەو چەكەی دەستی خۆی بكوژێ)) . ئەو هێرش و پەلامارو غەزوە بیری و ڕەوشتییە نوێیە، لـە سـێ شێوەو شێوازدا خۆی دەبینێتەوە :

١- مژدەدان (ألتبشیر)

٢- ڕۆژهەلاتناسی (ألاستشراق)

٣- داگیركردن (ألاستعمار)

بۆ هەر یەكێك لەم بابەتانە دەروازەیەكی تایبـەت دیـاری دەكـەین، بـە سەر سێ بەش دابەشی دەكەین :

بەشی یەكەم : پێناسینی هەر یەك لەم سێ هەڵمەت و هێرشانە.

بەشی دووەم : ئامانجەكانی ئەم هێرش و هەڵمەتانە و ئامرازەكانیان و جێبەجێكردنی ئەو ئامانجانە دەخەینە ڕوو .

بەشی سێیەم : گۆڕەپان و مەیدانەکانی ئەم هێرشانەو کاریگەرییەکانی ڕووندەکەینەوە، مەبەست لەگۆڕەپان و مەیدانەکان ئەو وڵاتانەن، کە چالاکی ئەو هەڵمەتانەی تێدا دەرکەوتووە.

**بەشی سێیەم : گۆڕەپان و مەیدانەکانی ئەم هێرشانەو کاریگەرییەکانی ڕووندەکەینەوە، مەبەست لەگۆڕەپان و مەیدانەکان ئەو وڵاتانەن، کە چالاکی ئەو هەڵمەتانەی تێدا دەرکەوتووە.**

# بەشی یەکەم

## پێناسەی مۆژدەدان

ووشەی موژدەدان، لەزماندا، ئەو هەواڵەیە کە بۆ دڵخۆشـی بـەکاردێت، بەڵام بەپێ ی بنچینەی زمانەوانی، دەربڕینێکە بۆ ئەو هەواڵە بـەکار دێـت کـەکار لەپێسـتی مـرۆڤ دەکـات و دەیگۆڕێـت (مەبەسـت لـە مووچـڕکە) (وەرگێڕ) ئەو گۆڕانە لەوانەیە بۆ ناخۆشیش بەکاربێت، هەروەکو چۆن بـۆ خۆشی بەکاردێت، لەڕاستیدا پێویستە موژدەدان بکرێتە دووبەش .

مـوژدەدان لای گاورەکـان (نەسـرانییەکان) واتـە هێـرش و هەڵمـەتی نەسرانییەت بۆ سەر ئەو ئاینانـەی نیشـتەجێ ی وڵاتـەکانی خۆیـانن ، کـە مـوژدەدەرە نەسـرانییەکان ڕووی تێدەکـەن، بەمەبەسـتی بڵاوکردنـەوەی گاوریەتی و موژدەدان، بەتایبەتی بۆسەر ئاینی ئیسلام.(١)

---

[١] الغزو الفكري، علي عبدالحليم محمود، ص ١٣٧

# بەشی دووەم

## ئامانجەکانی موژدەدەران و ئامرازەکانی

### أ- ئامانجەکانی موژدەدەران :

دەتوانین گرنگترین ئامانجەکانی موژدەدەران لەم خاڵانەی خوارەوە کورت بکەینەوە :

١- ئامانجی سەرەکی لە پیلانگێڕانی موژدەدەرە نەسرانییەکان بریتیە لە هەڵگێڕانەوەی موسڵمانان لە ئایینەکەیان، ئەگەرچی بەرەو ئیلحاد و بێ باوەڕی و بەدرۆخستنەوەی ئاینیش بچن .

٢- موژدەدەرەکان سەیریان کرد، ڕەوشتە ئیسلامییەکان لە دیاردە کردەییەکانی بیروباوەڕو ئیمان بەخولو بەڕۆژی دوایین، ئەمەش گەورەترین هۆکارە، هێزو توانا دەبەخشێتە موسڵمانان، موژدەدەرەکان هەوڵیان داوە، ئەو خو و ڕەوشتە بڕوخێنن، بۆئەوەی موسڵمانان لاواز ببن هێز و تواناییان لەدەست بدەن و ورە بەر بدەن و پەرتەوازە بن .

٣- بەفیڕۆدانی ماڵ و سەروەتی موسڵمانان و بەنیشاندان و دەرخستنی هۆکارەکانی ڕابواردن و خۆشگوزەرانی و جوانییەکان، ئاسانکردنی ڕێگای بەرەو حەرام و قەدەغە چوون، بەمەش هەموو

توانا بیری و جەستەیی و دەروونییەکان هەڵدەمژن و بەفیڕۆی دەدەن .

٤- گۆڕین و لادانی ڕێباز و ڕێڕەوی بیرکردنەوە لە یەکێتی و یەکگرتنی ئوممەی ئیسلامی، چونکە یەکبوونی موسڵمانان گەورەترین مەترسییە لەسەر گاورەکان (مەسیحیەکان) .

٥- تێکدانی ویژدانی موسلمانان جولاندن و جێ لەقکردنی عەقیدەو بیروباوەڕی موسڵمانان، بۆ دوورخستنەوەیان لە پەرستنی خوای تاك و تەنیا .

## ب – ئامرازەکانی موژدەدەران :

### یەکەم : سوود وەرگرتن لەزانست بۆ موژدەدان :

ئامانجی موژدەدەران لە دروست کردنی قوتابخانەو کۆلیژەکان تەنیا زانست نییە و بەس، بەڵکو موژدەدان و بانگەوازکردن بۆ نەسرانییەت ئامانجیانەو ڕابەرایەتی خەڵکە بۆ (مەسیح) ، هەتا خەڵکی دەبنە گاورو مەسیحی . زانکۆکانیان بەهیچ شێوەیەك موسڵمانی تێدا دانامەزرێنن و ئەو کتێبانە دەخەنە ناو پرۆگرامەکانی خوێندن و بۆی زیاددەکەن، کەئیسلام و مێژووی ئیسلام و کەسایەتییە موسڵمانەکان دەشێوێنن و ناشیرینی دەکەن بەبوختان و درۆ و دەلەسە . هیچ شتێك ڕێگرنییە لەبەردەمیان، کەنیسەیەك لەتەنیشت قوتابخانەیەك بنیادبنێن و دروست بکەن؛ هیچ هەلێك لەکیس نادەن، کەزانکۆکانیان لەتەنیشت ناوەندە

ئیسلامییەکان دروست بکەن، ئەو ناوەندانەی رووناکی دەنێرن و دەبەخشنەوە بۆ هەموو پارچەکانی جیهان و بلاوی دەکەنەوە . زانکۆی ئەمریکیان لە قاهیرە دروست کرد، لەنزیك زانکۆی ئەزهەر . ئەمە جگە لەدروستکردنی قوتابخانەی ئاینی کچان لە بەیروت .

هەندێك لەرۆلەکانی موسلمانان کۆشش دەکەن و هەولدەدەن بۆدەستخستنی ئەو زانستەی، کە لەگەل حەز و ئارەزووی فێتریان دەگونجێت و رێکدەکەوێت و سەرکەوتوو دەبن تیایدا و پسپۆری وەردەگرن لە بواری زانستە دەگمەنەکان دا، بەلام هەولەکانی مۆژدەدەرەکان و گاورەکان ئەوەیە، کە رێگرو بەربەست دروست بکەن، بۆ گەیشتنی ئەو کەسانە بە ناوەندەکانی فێربوون و بەرێوەبردن و بەرهەمهێنان . بەنیازی کوشتن و بەفیرۆدانی ئەوزانستەی بەدەستیان هێناوە لەماوەی چەند سالی رابوردوودا، بەمەش ئەو کەسانە رووبەکەنە ئەو کارانەی، کەهەموو کەسێك دەتوانێ ئەنجامی بدات، ئەگەر تەنیا خوێندن و خوێندەواریان هەبێت . بۆ ئەوەی دووریان بخەنەوە لەوشتەی، کە سوود بە نەتەوە موسلمانەکەی خۆی بگەیەنێت، ئەگەر بەم هەولەش سەرکەوتوو نەبوون، هەولدەدەن فریوی بدەن بەکۆچکردن بۆ یەکێك لە ولاتە بیانییەکان و کارکردن لەوێدا، بەپلە و پایەکی بەرز و موچەیەکی زۆر، بۆئەوەی پسپۆرییە دەگمەنەکەی بۆ سوودی ئەوان بەکاربهێنێت و بەرهەمەکەی بۆ ئەوان بێت، زانستەکەی بچێتە سەر میراتی زانستی ئەوان و نەتەوەو ئوممەتە موسلمانەکەی خۆی لەو زانستە بێ بەش بێت .

لە ڕاستیدا موژدەدەرەکان نەخشە و پیلانێکی زۆر وردو تۆکمە و پتەویان هەبوو، بۆ بێ بەشکردنی موسڵمانان لە زانستە کردەییەکان، بەربەست دروست کردن لەبەردەمیاندا، بەشێوازی جۆراو جۆر و ئامرازی جیاواز، لەوانە :

١- خەریککردنی ڕۆڵەی موسڵمانان بەزانستە تیۆرییە پەتیەکان ئەو زانستانەی دوورن لە بوارەکانی جێبەجێکردن و سوود گەیاندن و پەیوەندارن بەدەسکەوتی زانستی، کاریگەری ماددیان هەیە لەسەر داهێنانە پیشەسازییە نوێیەکان، ئەمەش بەمەبەستی بڵاوکردنەوەی ڕەوتی دواکەوتن و بەجێ مان لە دەسکەوتەکانی سەردەم .

٢- خەریککردنی موسڵمانان بە فەلسەفە فیکری و بیرییە ناکۆك ودژبەیەکەکان، نقوم کردنیان لە ململانێی بنەما کۆمەڵایەتییەکان، بەمەستی کوشتن و بە فیڕۆدانی هێزی بیریان .

٣- خەریککردنی موسڵمانان بەکۆمەڵێك شتی تورەهات و پڕوپووچی دەربڕین، کەناویان ناوە (ئەدەب) (وێژە) بێ ئەوەی هیچ بەرهەمێکی، یا سوودێکی پەروەردەیی پتەو (*) یا خووڕەوشتێکی باش، یا بیرێکی زانستی باشیان هەبێت یان چێژ و زەوقی مرۆڤ پەرەپێبدەن .

* مەرج نییە هەموو ئەدەبێك قسەی بێ سوود بێت، چونکە ئەدەبی پەیامدارمان زۆرە (وەرگێڕ) .

٤- دانانی هونەرەکانی نواندن و سەما کردن و گۆرانی و وێنەکێشان و پەیکەرتاشی، لە لیستی ئەو زانستانەدا، کەپێشکەوتن و سەرکەوتنی نەتەوەو گەلەکانی لەسەر وەستاوە، ئەمەش بەمەبەستی دوورخستنەوەی بەکارهێنانی وزە و هێز و توانابیرییەکان لە زانستە سوودبەخشەکان.

## دووەم: سوود وەرگرتن لە نەخۆشی وەك ئامرازێکی موژدەدان

موژدەدەرەکان وای دەبینن، گرنگە پیشەی پزیشکی سوودی لێوەربگیرێ و بکرێتە یارمەتی دەر بۆ مژدەدان و بە گاورگردن، بەم مەبەستە چەند ناوەند و دەزگایەکی پزیشکیان دامەزراند، لەسەرەتادا وەکو ناوەندێکی چارەسەری نەخۆشی بەکاریان دە هێنا، زۆری نەخایەند، رووی راستەقینەیان بەدیارکەوت، کە ئەو ناوەندانە بۆ بەگاورکردن و مژدەدان بەکاردەهێنران، کاری پزیشکی کەم بۆوە لەم ناوەندانەدا، تا لەکۆتاییدا وای لێهات تەنیا بۆ کاری بەگاورکردن و مژدەدان بەکاردەهێنران . پزیشکە موژدەدەرەکان چارەسەری نەخۆشیان نەدەکرد، تاوایان لەنەخۆشەکە نەکردبایە، کەدان بنێنن بەوەی، کەئەوەی شیفای بۆ دەنێرێت (مەسیح) ە، چارەسەریشیان بۆ نەخۆشەکە دەست پێ نەدەکرد، تا نەخۆشەکە چۆکی نەدابایە و داوای شیفای لە مەسیح نەکردبا. زۆربەی پزیشکە پرۆتستانتەکان، کە هاتوون بۆ ولاتە عەرەبی و رۆژهەلاتییە ئیسلامییەکان، بۆ ئەنجامدان و بەجێگەیاندنی پەیامی مرۆڤایەتی پزیشکی چارەسەری نەخۆشی نەهاتوون، بەلکو لە

خۆشەویستی بۆ مژدەدان بەگاورکردن و مەسیحیەت هاتوون .
مژدەدەرەکان رۆڵی ئافرەتی موسڵمانیان بەهەند هەلگرتووە و گرنگیان پێداوە و پزیشکی ئافرەتیان بۆ رەوانە کردوون و پەیوەندیان پێوەکردوون، بیری نەسرانییەتیان لە مێشك چەسپاندوون، وەك : دیاری کردنی وەچە وسنووردارکردنی وەچە(تحديد ألنسل)، ئەمە جگە لەوەی کە راهیبەکانیان راهێناوە و مەشقیان پێکردوون لەسەر پیشەی پزیشکی و پەرستیاری .

ئەو لادانە بەرچاوەی لە ئەرك و پەیامی پیشەیەکی مرۆڤایەتی وەك پیشەی پزیشکی کراوە، ئەو تاوانە گەورەیە مژدەدەرەکان ئەنجامیان داوە، بەتایبەتی مژدەدەرە ئەمریکییەکان .

## سێیەم : بەکارهێنانی کاری کۆمەلآیەتی وەك ئامرازێکی مژدەدان

مژدەدەرەکان هاتن بۆ رۆژهەلاتی ئیسلامی و کۆمەلێك بیروباوەریان سەبارەت بە هەندێك مەبەستی کۆمەلآیەتی لەگەڵ خۆیان هەلگرتبوو . ویستیان ئەو بیروباوەرانە بگوازنەوە بۆ موسڵمانان، ئەوەیان بەسەر تێپەریوە، کە ئیسلام تەنیا ئاینێکی سادەو ساکار نییە، بەلکو ئیسلام عەقیدەو بیروباوەڕ و سیستەمێك پێرەوێکی کۆمەلآیەتییە، بۆیە هەرچی ئەو مژدەدەرانە هێناویانە، سەیردەکەین لە ئاینی ئیسلامدا بە شێوەیەکی باشتر وچاکتر لە هی ئەوان هەیە . لەگەڵ ئەوەشدا مژدەدەران چەند دروشمێکی،وە ك : (بەزەیی لەگەڵ ئاژەلآن) (منداڵ

بۆ قوتابخانە و خوێندنە نەك بۆ کارکردن) بەرزکردۆتەوە .بەم دروشمانە مەبەستیان چاکسازی کۆمەڵایەتی نەبوو، بەڵکو موژدەدەرەکان مەبەستیان لەم دروشمانە لادانی دڵی موسڵمانانە و بۆ ئەوەی بۆیان ئاسان بێت، دزە بکەن و بخزێنە ناو کۆمەڵی موسڵمانان بەمەبەستی موژدەدان و بەگاورکردن . موژدەدەرەکان پیلانێکی زۆر وورد و تۆکمەیان دارشت بۆ لەبەریەك هەڵوەشاندنەوەی خێزان و پچراندنی شیرازەی خێزان و تێکدان و پچراندنی شیرازەی نێوان تاکەکانی کۆمەڵگا، بۆئەوەی تاکەکانی ئەو کۆمەڵگایە، کەسایەتییەکی یەکگرتووی بەهێزیان نەبێت .

کەسایەتی کۆمەڵایەتی، کەسایەتی خۆی لە چوار یەکە وەردەگرێت :

(١)یەکێتی بیری .

(٢)یەکێتی عەقیدەو بیروباوەڕ .

(٣)یەکێتی خووڕەوشت .

(٤)یەکێتی هەست و سۆز .

ئەو چوار یەکەیە یان یەکێتیە، بوونەتە ئامانج بۆ تیری دوژمنان، دوژمنان تیرەکانیان ئاراستەی ئەو چوار ئامانجە کردووە، بەمەبەستی بەش بەش کرنی ئەو یەکانەو دروستکردنی ناکۆکی و دژایەتی لەنێوانیاندا، بەمەش دەیانەوێت یەکێتی بیری لە ناو موسڵماناندا بگۆڕن، بەبیر پەرتەوازەی و تێکەڵاوکردنی بیرە دژ بەیەك و ناکۆکەکان، هەروەکو چۆن ویستوویانە دەستکاری، یان یاری بە ڕێبازی لێکۆڵینەوەی دروست لای موسڵمانان بکەن، ئەو ڕێبازەی، کە خوای گەورە بە نیگا ڕێنوێنی کردوون، بیگۆڕن بە ڕێبازێکی (کورتبین) ئەو ڕێبازە کورتبینانەی ، کە

تەنیا لە سنووری ماددی بینراو دەوەستن و ناتوانن تێپەڕن و پەی بەو ڕاستیانە ببەن، کە دەکەونە دولوەی ئەم سروشتە ماددیەوە .

دەیانەوێت لەبری یەکێتی عەقیدە و بیروباوەڕ، ئەو عەقیدەیەی دەسەڵاتی بە سەردڵی موسڵمانان کێشاوە، ڕێبازەکانی وەك بوونگەرایی، بێ باوەڕی دابنێن، بەمەش کاردەکەن لەسەر گۆڕینی مرۆڤ بۆ بوونەوەرێکی خۆپەرست و دڕندە، کە هەموو زیرەکی و تواناکانی خۆی بۆتێرکردنی حەز و ئارەزوو خۆپەرست و دڕندەیی یەکانی خۆی بەکاردێنێت .

دەیانەوێت لەجیاتی یەکێتی هەست و سۆز، ئەو هەست وسۆزەی سەرچاوە دەگرێت لە بنەمایەکی ئایینی تۆکمە و پتەوو ڕەگ داکوتاو، کە موسڵمانان دەجوڵێنێت، بیگۆڕن بە هەست و سۆزێکی پەرتەوازەو دژ بەیەك و ناکۆك و جارێك لەشێوەی هەرێمایەتیدا، جارێك لە شێوەی چینایەتیدا و جارێکی تریش لەسەر شێوەی بەرژەوەند پەرستی و هەلپەرستیدا .

هەرچی خووڕەوشتی موسڵمانانە، موژدەدەرەکان دوو ڕێگایان داهێناوە و دۆزیوەتەوە بۆ گەیشتن بە تێکدان و نزمکردنەوەی خووڕەوشتی موسڵمانان لەو پەڕی تەواوی و بەرزی مرۆڤایەتی بۆ ئەو پەڕی نزمی و کەم و کوڕی و سوك و ڕیسوایی .

١- ڕێگای یەکەم : شێواندن و سوکایەتی کردن بە چەمکە ڕەوشتی یەکان .

٢- ڕێگای دووەم : تێکەڵ بوون بەو کۆمەڵ و کۆمەڵگایانەی بێ ڕەوشتن .

## ١- ڕێگای یەکەم : شێواندن و سوکایەتی کردن بە چەمکە ڕەوشتی یەکان :

موژدەدەرەکان هەڵساون بەکۆکردنەوەی چەندین تیۆری فەلسەفی لادەر لە شەریعەتی خوا، لەو تیۆریانەدا پشت دەبەستن و جەخت دەکەنەوە لە سەر پیاهەڵدان و بەرزکردنەوەی چێژولەزەتی تاکەکەسی و ڕێپێدانی هەرشتێك ببێتە جێبەجێ کردنی ئەو چێژو لەزەتە، جا ئەگەر ئەو شتە زیان بە تەندروستی تاك بگەیەنێت، یان بە عەقڵی تاکەکەس بگەیەنێت، یان زیان بەکۆمەڵ بگەیەنێت، بێ گوێدانە ئەوەی کە ئەو شتە پێچەوانەی فەرمانی خوای گەورەیە، بەتایبەتی ئەو تیۆریانەی جەخت لەسەر بەرزکردنەوەو پیاهەڵدانی هێزی کۆمەڵ (کۆمەڵگا) دەکاتەوە، کەدەوڵەتی سیاسی نوێنەرایەتی دەکات لەوانە، ئەو گومڕایی یانەیان لەناو گەلە موسڵمانەکاندا بڵاو کردەوە، کەخووڕەوشت شتێکی لەبەرچاوگیراوە و ڕەچاوکراوە (وەکو داب و نەریت) بەپێی بەرژەوەندی کۆمەڵایەتی و رامیاری و ئابووری، نموونەش بۆ ئەمە بەکۆمەڵگا سەرەتاییەکان دەهێننەوە و دەڵێن هەندێك هۆز و قەبیلەی سەرەتایی گۆشتی مردووەکانیان دەخوارد، بەهاندەرێکی ئابووری، هەندێك گەل و نەتەوەش لە ڕووتی و زینا کردن هیچ شتێك نابیننەوە و بەلایانەوە گرنگ نییە و زۆرئاساییە .

گوێگر لەو نموونانەوە، ئەوە وەردەگرێت و ئەو نموونانە بەلای گوێگرەوە ئەوە دەگەیەنێت، کە ڕەوشت شتێکی لەبەرچاو گیراو و

ڕەچاوکراوە، گەل و نەتەوەکان لەسەری ڕێککەوتوون، نەوەك شتێکی خوایی بێت.

لەسەر بابای مۆژدەدەر، خاوەنی ئەم گومڕاییانە ئەوەیە، دەبێت لەگەڵ خۆی تەباو گونجاو بێت و بڵێت ، کە پێشکەوتنی شارستانی و مەدەنی بەهەمان شێوە هیچ و پێنەو دیمەن و شێوەیەکی وەستاوی نییە، بەکارهێنانی چەقۆ گۆڕا بەبەکارهێنانی چەك لەکاتی شەڕکردندا، بەهەمان شێوە لە دیمەنە نوێیەکانی شارستانییەت و مەدەنییەت، پێویستە ئەم چەمکانە لەگەڵ ڕەوشت یەکسان بن، پێ بە پێی ڕەوشت بڕۆن، جا ئەگەر ئەمە لەلایەن مەدەنییەتەوە ڕەتکراوە بێت، ئەوا لەبوارەکانی شارستانیەتی ڕەوشتی، یان ژیارو شارستانییەتی بنیادنراو لەسەر ڕەوشت، ئەولاترە بەڕەتکردنەوە .

## ٢- تێکەڵ بوون بەو کۆمەڵ و کۆمەڵگایانەی بێ ڕەوشتن :

ئەمە بەهێزترین ئامرازی کرداری(عملی)، تێکدان و خراپکردنی ڕەوشتە، مرۆڤ بەسروشتی خۆی قابیلی خۆگونجاندن و ڕاهاتن و کەوتنەژێرکاریگەری ژینگە و دەوروبەری کۆمەڵایەتی یە، ئەگەر کەسێکی پاك و خۆپارێز بخەینە ژینگەیەکی کۆمەڵایەتی، کە زۆربەی خەڵکەکەی خراپەکاربن ئەو کەسە خۆپارێز و پاکە، دەبینین پلەبەپلە دەگۆڕێت بۆ ئاستی ئەوان . نووسەرەکانی ئەم مۆژدەدەرانە ئەو سروشتە دەروونییەی مرۆڤیان زانیوە و پرۆگرامێکی کرداری و کارەکیان بۆ داڕشتووە . مۆژدەدەرەکان دەست پێشخەربوون بۆلێکۆڵینەوە و کارکردن بۆتێکدان و

خراپکـردن و فەسـادکردنی نـەوەی دوای نـەوەی موسـڵمانان، لەڕێگـەی تێکـەڵاوبوون بـە کۆمـەڵگا دەردەدارەکـان و نەخۆشـەکان لـە ڕووی ڕەوشتییەوە و لەم ڕێگایەشدا ئەو ڕەگەزانەی خوارەوەیان بەکارهێناوە .

### أ- ڕەگەزی پارەو سامان :

ئـەو ڕەگـەزە زۆر کاریگـەرە بـۆ کڕینـی مرۆڤـەکان، موژدەدەرەکـان توانیویانە ئەم هۆکارە بەشێوەیەکی زۆر فراوان بـەکاربهێنن بـۆ تێکـدان و خراپکردنی ڕەوشـتی موسـڵمانان، لەڕێگـەی کڕینـی مرۆڤـە لاواز و نـەفس نزمەکان، بـەپارەو سـامان، ئەوکەسـانەیان، هەرچـۆنێك خۆیـان بیانـەوێت بـەکاریان هێنـاون و ئاڕاسـتەیان کـردووە بـۆ بڵاوکردنـەوەی بـەرتیل و هاندانیان، لەسەر( دزینی سـەروەت و سـامانی گشـتی و پاڵپشـتی کردنـی قۆرخکاری حەرام وچاوپۆشی کردن لەغەش وخیانەت و بـردن و دەرکـردن و پەڕاندنەوەی ئەوشتانەی لەڕووی نێودەوڵەتییەوە یاساغ و قەدەغەن.

### ب- بەکارهێنانی ڕەگەزی ئافرەت :

موژدەدەرەکـان ئـەو ڕەگـەزە بـەکاردەهێنن بۆدەسـت بەسـەراگرتنی خاوەن دەروونـە لاوازەکـان، بەتایبـەتی گـەنجان، هـەڵیان دەخەڵـەتێنن و گاڵتـەیان پێدەکـەن ، لـەپاش ئـەوە، بنـەما مـاددی و مەعنـەوی یـەکانی موژدەدەری و گاوری لە وڵاتەکەدا قایم دەکەن و دەچەسپێنن .

لەپاڵ ئەو دوو ڕەگەزە، ڕەگەزی عارەق و خواردنەوە و ماددەپەرسـتی و ژیانی ماددیان لەلا شیرین دەکەن، ئەمە جگە لـەو شـێوازە ژیانـەی، کە

پشت دەبەستێ لـە سـەر خۆشـگوزەرانی و چێژ و لـەزەت و گـوێ نـەدان بەهیچ شتێك جگە لەوەی، کە هێز و وزە و توانای بیر وجەستە بمژن و بـە فیڕۆی بدەن، لەچێژ و لـەزەت و ڕابواردنـدا .موژدەدەرەکان، ئامۆژگاری هاوکـار و یارمەتیـدەر و بـەکرێگیراوەکانیان دەکـەن، کـە کاروبـاری کۆمەڵایەتی ئاسان بکەن لەسەر ئەم بنەمایانەی خوارەوە :

١- دابینکردنـی مـاڵ و خـانوو بـۆ قوتـابی و خوێنـدکاری کـوڕ و کـچ . دروستکردنی کۆمەڵەی گەنجان و لاوانی کوڕ و کچ .

٢- دروسـتکردن و دابینکردنـی، یانـە و هانـدانی کـوڕ و کـچ لەسـەر تێکەڵاوبوون .

٣- گرنگی دان بە فێرکردنی وەرزش و ڕابواردن و کات بەسەربردن .

٤- ڕاکێشـانی ژن و ئافرەتـانی بێگانـە، ئەوانـەی لـەبواری مـوژدەدان کاردەکەن، بـۆ ئـەوەی پەیوەنـدی بـەژنان و ئافرەتـانی موسـڵمان بکەن .

٥- هاندانی گەنج و لاوی موسڵمانان بۆهێنانی ژنی بێگانە، لێرەدا ئـەو ڕێگەپێدانـەی شـەریعەتی ئیسـلام ئیسـتغلال دەکـەن و سـوودی لێوەردەگرن، کە ئیسلام ڕێگەی داوە پیـاوی موسـڵمان ئافرەتـانی ئـەهلی کیتـاب مارەبکـەن . ئاشـکرایە: ئـەو جـۆرە هاوسـەرگیرییە ژینگـەو جـەوی ڕۆحـانی مـاڵی موسـڵمان دەشـێوێنێ و نـابهێڵێ، گـوزەران و ژیـانێکی بێگانـەیی دەسـت بەسـەر مـاڵ و ژینگـەی موسـڵماندا دەگرێـت، کـە زیـاتر مـۆرکی بێگانـەی پێوەدیـارە، بەتایبـەتی ئـەو زمانـەی کـە ژنەکـە قسـەی پێـدەکات، منـداڵ لەدایکیەوە فێری زمـانی بێگانـە دەبێـت، بەمـەش زمـانی عـەرەبی

دەڵەوتێت کە زمانی قورئانی پیرۆزە .

٦- دروستکردنی کتێبخانەی تایبەت بە کتێب و بڵاوکردنەوەی مژدەدەری و بەگاورکردن، بۆ فرۆشتن و بەنهێنی دابەشکردن و بڵاوکردنەوەی ئەو کتێب و بڵاوکراوانەی تایبەتن بەگاورکردن .

٧- ئیستیغلال کردن و سوود وەرگرتن لە ڕۆژنامە و ڕۆژنامەگەری بەشێوەیەکی زۆر فراوان بۆخزمەتکردنی ئامانجەکانی بەگاورکردن، چونکە مژدەدەرەکان سەیریان کرد موسڵمانان زۆر هۆگری ڕۆژنامەن و زۆرخۆیان بەخوێندنەوەی ڕۆژنامەوە سەرقاڵ دەکەن .

٨- خزان و چوونە ناو کۆمەڵگا پیشەسازیەکانی موسڵمانان، مژدەدەرەکان تێکەڵاوی کرێکاری کارگەکانی موسڵمانان دەبن دەست دەگرن بەسەر ناوەندەکانی پیشەسازی موسڵمانان، بەگیانێکی نەسرانی و گاوری، جێگیرکردنی بیری نەسرانی و گاوری لەناویاندا .گرنگترینیان :

أ- پێشکەوتنی زانستی و پیشەسازی، بناغە و سەرچاوەکەی لەنەسرانییەت هاتووە، خۆگێلکردن و لەبەرچاونەگرتنی ڕۆڵ و کاریگەری زانا موسڵمانەکانی پێشین، کەخاوەنی چاکە و مافن بەسەر ئەو بوژانەوەیەی لە ئەوروپا ڕوویدا.[1]

ب- هەموو داهێنانە نوێیەکان و دۆزینەوە تازەکان، چاکەکەی دەگەڕێتەوە بۆ مەسیحییەت .[2]

---

[1] التبشير و الاستشراق - محمد عزت

[2] اجنحه المكر الثلاثه- عبدالرحمن حبنكه

# بەشی سێ یەم

## گۆڕەپانەکانی موژدەدان و کاریگەریەکانی

موژدەدەرەکان لەگەڵ جیاوازی بیر و باوەڕ و ڕەوت و ڕێبازی بیریان و جۆراوجۆری فرەیی مەزهەب و کۆمەڵە موژدەدەرەکانیان، هەڵساون بە وێنەکێشانی نەخشەیەکی ووردی جیهانی ئیسلامی، کەهەموو لایەنەکانی کۆمەڵگای ئیسلامی بەمرۆیی و نا مرۆیی (البشرية و غير البشرية) بگرێتەوە. لەنەخشە و پیلانەکەیاندا بۆسەر جیهانی ئیسلامی و هێرشکردنە سەری، موژدەدەرێکی زۆریان بۆ ئامادەکردووە و بۆ ناردووە هەوڵیانداوەو سووربوون لەسەرئەوەی جیاوازییە مەزهەبەکانی نێوان خۆیان لەبیرببەنەوە و بخەنە لاوە، ئەمەش بەمەبەستی یەکخستنی وزە و تواناکانیان بۆ دژایەتی کردنی ئیسلام و ڕوخاندن و تێکدانی پایە و کۆلەکەکانی ئیسلام و گۆڕین و لادانی موسڵمانان لە ڕێنمایی یەکانی ئیسلام و وەستاندنی درێژبوون و فراوانبوونە سروشتیەکەی .

گرنگی دان بە ڕەوانەکردن و بەڕێکردنی موژدەدەرەکان لەچەرخەکانی ناوەڕاستدا ، گەیشتە چلە پۆپە، تاگەیشتە ئەو ڕادەیەی نەسرانییەکان کۆلێژ دابمەزرێنن، کە ببێتە بناغەیەك بۆ دەرچوواندن و پێگەیاندنی موژدەدەرەان، لەپاش ئەوەی بنەماکانی بەگاورکردن و

ئامرازەکانی موژدەدان و بەگاورکردنیان فێردەکردن، پاشان ناردنیان بۆ هیند و جەزائیر و جاوا ئەو شاند و نێردراوانە سەرکەوتنێکی گەورەیان بەدەستهێنا، لەبەر ئەوە دەبینین موژدەدەری زیاتر گەشەی کرد و زیادی کرد، تا وای لێهات بەشی ئافرەتانیان کردەوە و دامەزراند و ئەوروپا زیاتر سەرقاڵی کارەکانی موژدەدان و هەوڵی بەگاورکردن بوون بە ئامانجی دەرهێنانی موسڵمانان لە ئاینەکەیان ، بۆ درێژەپێدانی ئەو نەخشەو پلانە، موژدەدەری پزیشکیان دامەزراند، وەکو ئەزموون و تاقیکردنەوەیەك، شاند و نێردراوی زۆریان نارد بۆ ئەفریقیای ناوەڕاست، ناوچەکانیان دابەشکرد، بەپێی ڕەگەزەکانیان، ئەو شاند و نێردراوانە بڵاوبوونەوە بەبێ پچڕان لەڕۆژهەڵاتی ئەفریقیا، تادەگاتە ناوەڕاستی ئەفریقیا، تادەگاتە (خەرتوم)ی پایتەختی سودان و حەبەشە (ئەسیوبیا) . هەرچی وڵاتانی ڕۆژئاوایە، موژدەدەری تایبەتیان بۆدanاون ((کۆمەڵەی موژدەدەران و بەگاورکردنی باکوری ئەفریقیا)) موژدەدەرەکانیان دەنارد و بڵاودەکردەوە لە وڵاتی مەغریب و جەزائیر و تونس هەموو وڵاتەکانی ڕۆژئاوا .

موژدەدەرەکان و شاندەکانیان بڵاوبوونەوە لەهیند، لەسەرەتادا موژدەدەرەکان توچاری دوو دڵی و ڕامان و دۆش دامان بوون، کە بەکێ دەست پێبکەن لەکاری بەگاورکردن، چونکە هیند خاوەن چەندین ئاینی جۆراوجۆرە، موژدەدەرەکان لەوێ ڕێگەیەکی نوێیان دۆزیەوە، ئەویش هەڵگرتنەوەی ئەو منداڵانەی، کە لەبەر هەژاری فرێدرابوون، چاکەیان بەرامبەر دەکردن بۆ ڕاکێشانی دڵیان بۆ ئاینی مەسیحی . هەرچی کاری

بەگاورکردنە لە وڵاتی (مەلایو)، لەبەرئەوەی خەڵکی مەلایو شتێکی کەمیان لەمەزهەبی (کاسۆلیك)ی وەرگرتبوو، لەپاش بەدیارکەوتنی (پورتوگالییەکان) و کەمێکیش لەمەزهەبی (پرۆتێستانت) یان وەرگرتبوو لە پاش داگیرکردن دەست بەسەرداگرتنی وڵاتەکەیان لەلایەن (هۆڵەندییەکان)، هۆڵەندییەکان زۆر دڵڕەقی و توندیاننواند، هیچ لێبوردنیان نەبوو لە پێناو بڵاوکردنەوەنەی عەقیدە و بیروباوەڕەکانیان لە سەدەکانی ناوەڕاست دا .

هەرچی بزوتنەوە بەگاورکردن و موژدەدەرەکانی (میسر) ە، موژدەدەرەکان هەڵسان بەدامەزراندنی زانکۆیەکی هاوبەش، کە هەموو دامەزراوە موژدەدەرەکان تێدا هاوبەش بن، بەجیاوازی مەزهەبەکانیان، بۆ ئەوەی بتوانن بەئاسانی بەریەرەکانێ و پێشبڕکێ لەگەڵ (ئەزهەری شەریف) بکەن، ئەو قوتابخانە و زانکۆیانە فێربوونی زمانی عەرەبی بەپاکی وبەچاکی شارەزابوونی زمانی عەرەبییان لە ئەستۆی خۆیان گرتبوو .

لەگرنگترینیان ئەو پەیمانگا موژدەدەریانەی، کە لە (میسر) دامەزراوە و دروستکراون، ئەوەی کە (کۆمەڵەی موژدەدەرانی باکوری ئەفریقیا)ی دروستیکردووە، موژدەدەرەکان توانیان لە ڕێگای ئەو پەیمانگایەوە لەموسڵمانان نزیك ببنەوە، لە ڕێگەی موحازەراتی هەفتانەو کۆڕ و گفتوگۆ لەنێوان موسڵمانان و نەسرانییەکاندا، ڕێگەدانی موسڵمانان بە ئامادەبوون لە کۆڕەکانیان و مافپێدانیان و ڕێگەپێدانیان بە قسەکردن لەو

کۆڕ و کۆبوونەوانە، ئەو کۆمەڵەیە چالاکییەکانی زۆر زیادی کرد و تاوای لێهات گۆڤاری زۆریان دەردەکرد و بڵاودەکردەوە.

## موژدەدان لە دورگەی عەرەبی :

موژدەدەرەکان بەچاوێکی زۆر ڕق و قینەوە ، سەیری دوورگەی عەرەبییان کردووە، چونکە ڕۆژێك لە ڕۆژان شوێنی هەڵاتنی خۆری ئیسلام بووە، لەبەرئەوەی شوێنە پیرۆزەکانی تێدایە و موسڵمانان هەموو ساڵێك لە هەموو وڵاتەکانی جیهاندا، بەمەبەستی حەجی ماڵی خوا ڕوو لەوێ دەکەن، لە ڕاستیدا ناردنی شاند و نێردراوی موژدەدەرەکان بۆ دوورگەی عەرەبی سەختی و دژواریەکی زۆری بۆ نەسرانییەکان دروست کردووە و تێچووخەرجییەکی زۆر گەورەیان بۆ تەرخانکردووە، لەگەڵ ئەوەشدا ئیسلام لەو کاتەی لە (مەککە)ەوە، پەیدابووە، ژمارەی موسڵمانان کەمی نەکردووە و بەردەوام لە زیاد بووندایە و لە فراوانبووندایە، لەپاشان ئیسلام تەنیا ئاینێك نەبووە، بەڵکو جیهادکردن و تێکۆشان لە ڕوکنەکانی و پایەکان ئەم ئاینەیە، هەرگیز ڕێنەکەوتووە، گەلێك موسلمان بووبن و هاتبنە ناو ئیسلامەوە پاشان بووبنەوە بە گاور.

## کاریگەریەکانی مژدەدان :

ئێمە ئەگەر بە دوای کاریگەریەکانی موژدەدەرەکان بکەوین، دەبینین ئەو موژدەدەرانە هیچ ڕیز و پلە و پایەك بۆ خودا (الله) دانانێن و هیچ کاتێك ئەو بەڵێن و پەیمانانەیان نەبردۆتە سەر، کە بەو گەل و

نەتەوانەیان داوە ، کە بۆی نێردراون، بەڵکو بە پێچەوانەوە بەردەوام لە پیلانگێری و ئاژاوەنانەوە و هاندان و ورووژاندنی دووبەرەکایەتی ودوژمنایەتی و ڕقەبەرایەتیدابوون، لە نێوان ڕۆڵەکانی یەك نەتەوە و یەك وڵاتدا، دەربارەی کاریگەریەکانی موژدەدەرەکان دەڵێن : ئەو شتەی گومانی تێدانییە، کامەرانی و خۆشحاڵی موژدەدەرەکان بۆ ئەو گۆڕانکاریانەی چۆتە ناو بیروباوەڕ و عەقیدەی موسلمانان، زۆر زیاترە، لەو کامەرانییەو خۆشحاڵیەی بە پێشکەوتن و بەرزبوونەوەی شارستانییەت هەیانە، ئەو پەروەردە و فێرکردنەیان وەکو کەرەستەیەك بەکاریان هێناوە، ئەنجامی زۆرگەورە ی بەدەست هێناوە، بەرهەمی بە سوودی بەجێ هێناوە، بەتایبەتی لەسەرمنداڵ وهەرزەکاراندا .

موژدەدەرەکان کاریان کردووە، لەسەر دروستکردنی ئەو هۆکارانەی، کە دەبێتە مایەی شەڕ و ئاژاوە لە نێوان ئەو گەل و نەتەوە موسڵمانانەی موژدەرەکان کاریان تێداکردووە . لەگەل ئەو حکومەتە ئەورووپیانەی موژدەدەرەکان شوێنکەوتووی سیاسەتی ئەوان بوون، مەبەست و ئامانجیش هاندانی هەڵگیرساندنی شەڕێکی بەردەوام بۆ سەر نەتەوە موسڵمانەکان، لاوازکردنی ئەو گەل و نەتەوە موسڵمانانەیە، هەروەکو ئەوەی لە تورکیا ڕوویدا، لە سەردەمی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی لەماوەی سەدەی هەژدەیەم و نۆزدەیەم، چونکە ئەوروپا و ئەمەریکا، تا ئێستاش بەچاوێکی ئاینی ڕەهەندێکی ئاینی سەیری هەموو شەڕەکان دەکەن . (المسألة الشرقية – مصطفى كامل) .

ئەو چالاکییانەیان لەبواری هەڵگیرساندنی شەڕ ئەم دەسکەوتانەی هەبووە :

أ- ڕوسیا بۆ ماوەی چەند سەدەیەك شەڕێکی نەپساوە و یەك لە دوایەکی لەگەڵ تورکیادا کرد، تا لاوازی کرد و دەستی گرت بەسەر وڵاتی (قەوقاز) و ناوچەی ( قرم )، هەروەها ڕۆمانیا و یۆنان و خەڵکی (چیای ڕەش) و بولگاریا شەڕیان لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانیدا کرد، تا لە ژێر دەسەڵاتی عوسمانی دەرچوون .

ب- نەمسا و فەرەنسا کاریان لەسەر وروژاندن و هاندانی گەلانی بەلقان دەکرد، لەدژی دەوڵەتی عوسمانی .

ج- هەرچی ئینگلترایە، لەسەرەوە خۆی وا نیشاندەدا، کە دۆستی موسڵمانانە، لەلایەکی ترەوە لە هەوڵی ئاژاوە نانەوە و پیلانگێڕی بوو دژی وڵاتە ئیسلامییەکان، هانی (ئەرمەنەکان و دروزەکان ) ی دەدا و هانی(کریت)یەکانی دەدا، لەکۆنگرەی بەرلین توانی دوورگەی (قبرص) ی دەست بکەوێت، بەبیانووی یارمەتیدانی (تورکیا) لەلایەکی تر، هانی روسیای دەدا، بۆ شەڕکردن و بەربەرەکانێ ی تورکیا . هەندێك لە موژدەدەرەکان پێشنیازی ئەوەیان کرد، کە بەریتانیا و فەرەنسا هاوپەیمانیەتی یەك دروست بکەن بۆ دەست بەسەراگرتنی ئەو کەنارانەی، کە ئەو کەشتییە بارهەڵگرانەی پێدەگەیشت، ئەوانەی کەل و پەلی شەڕیان هەڵگرتبوو بۆشەڕ لەگەڵ عەرەبە موسڵمانەکان .

ئەوە سەبارەت بە کاریگەریە دەرەکییەکان، گۆڕەپان و مەیدان و بوارێکی تریش هەیە، کە موژدەدەرەکان کاریان لەسەر کردووە، ئەویش

وروژاندن و هاندانی پشێوی و دروستکردنی تەنگ و چەڵەمەی جیاواز لە ناو وڵاتە ئیسلامییەکاندا، ئەویش بەهەڵگیرساندن و خۆشکردنی ئاگری دوژمنایەتی و ڕق و کینە ، لە نێوان ئەو توێژانەی ، کە کاری مژدەدان و بەگاورکردنیان تێدا ئەنجام دەدا، لە هەموو وڵاتە جیاوازەکاندا بۆ ئەوەی ئەمە ببێتە بیانوو بەهانە بۆ دەست تێوەردان و خۆتێهەڵقورتاندن لە کاروباری ناوخۆیی وڵاتان، بەمەبەست و ئامانجی پاراستنی کەمایەتییە نەسرانی و گاورەکان .

کاتێك شکستیان خوارد و سەرنەکەوتن لە دروستکردنی کاریگەری لەسەر ژینگەی موسڵمانان، کەوتنە وروژاندن و نانەوەی دووبەرەکی لەنێوان تایەفە و مەزهەبە نەسرانییەکان، قەڵس و بێزاردەبوون بە لەیەکتر نزیکبوونەوەی موسڵمانان و هەڵکرانی بیر و باوەڕی ئاینەکانی تر، ئەرمەنییەکانیان هاندا بۆ شۆڕش کردن لەدژی دەوڵەتی عوسمانی، تایەفەی ئاشوریان هاندا، لە وڵاتی عێراق دژی حکومەتەکەی، ئاشوریەکان تایەفەیەکی کەمی نەسرانییەکانن، لە باکوری عێراق نیشتەجێن، هیچ پەیوەندییەکیان نییە، بەو ئاشوریانەی لە عێراق دا نیشتەجێ بوون لە پێش زایینیدا.(١)

١ بیروبۆچوونی جیاواز هەیە، سەبارەت بەپەیوەندی ئەو ئاشوریانەی ئێستا، بە ئاشوورییەکانی پێش زاین ، پەیوەندییەکە بە هەر شێوەیەك بێت، مانەوەیان لە کوردستانی عێراق دوو ڕاستیمان بۆ دەسەلمێنێ .

١- هەرچەندە کەمینە بوون، بەلام لە کوردستان ماونەتەوە و لە ناو کوردا نەتواونەتەوە و مافیان پارێزراو بووە، ئەمە ش نیشانەی سنگ فراوانی کوردە،

موژدەدەرەکان کاریان بۆ ئەوە کردووە، داگیرکەر و ئیستعماری بەریتانیش یارمەتی داون، کە بتوانن تاکەکانی ئەو تایەفەیە کۆبکەنەوە و ببنە لایەنگری هێزەکانی بەریتانیا بۆ لە دژوەستان و بەرامبەر وەستانیان لە دژی شۆرشگێرانی عێراق .

موژدەدەرەکان کاریان دەکرد لە دژی بلاوبوونەوەی ئیسلام و چەوساندنەوەی موسلمان و بلاوکردنەوەی خەراپە و خەراپەکاری .

موژدەدەرەکان ئەگەر تێبینی ئەوەیان بکردبا، کە خەلکی ئایینە (ولنیە کان) نایەنە ناو ئاینی مەسیحی، هەر وەکو ئەوەی لە باشوری (سودان )رویدا چالاکییەکانیان تەنیا لەوە کورت دەکردەوە و چرکردەوە، کە کۆسپ و لەمپەر لەبەردەم بلاوبوونەوەی ئایینی ئیسلام دروست بکەن.

موژدەدەرەکان کاری سیخوری یان لەسەر ئەو گەلو نەتەوانە دەکرد، کە کاری بەگاورکردنیان تێدا ئەنجام دەدا بۆ بەرژەوەندی ئەو ولاتانەی، کە موژدەدەرەکان لە رووی سیاسی وڕامیارییەوە شوێنکەوتوویان بوون.

---

چونکە زۆر نەتەوە و کەمینەی تر هەن لەمێژوودا ، توانەتەوە لە ناو نەتەوەکانی تردا، .

٢- کورد نەتەوەیەکی موسلمانە ئاشوریەکان نەسرانین بەلام بە درێژایی هەزاروچوارسەد ساڵ لە مێژووی پەیدابوونی ئاینی ئیسلامدا ئەو کەمینە ئاینییە نەبوون بە موسلمان و لەسەر ئاینی خۆیان ماونەتەوە ئەمەش سنگ فراوانی موسلمانان دەردەخات بەرامبەر ئایینەکانی تر. (وەرگێڕ)

**پوختە :**

گۆڕان لە نەسرانییەتەوە، بوون بەموڵسمان زۆر زیاترە، لە گۆڕان لە موسڵمانییەتی و بوون بەنەسرانی . بەڵام مەسیحیەت کاریگەریەکی زۆر گەورەی لەژیان و خووڕەوشتی موسڵمانان کردووە، ئەمەش لەسەر دەستی ئەو موژدەدەر و شاندە نێردراوانەی موژدەدەرەکان بەدی هاتووە . لەگەڵ ئەوەشدا دەبێت ئاماژە بەوە بدەین کە هەرگیز ڕووی نەداوە، لە هیچ وڵاتێکدا، کە خەڵك بە ژمارەیەکی زۆر فراوان لە موسڵمانییەتەوە بگۆڕین و ببن بە نەسرانی، تەنیا بەگۆڕینی حکومەتی ئەو وڵاتە، لە حکومەتێکی ئیسلامی گۆڕانی بە حکومەتێکی ڕۆژئاوایی مەسیحی ئەمەش، لەبەر ئەوەیە ئەو حکومەتە مەسیحییانە پەیڕەوی ڕێباز و سیاسەتێکی کاریگەریان کردووە بۆ یارمەتیدانی شاند و نێردراوی موژدەدەرەکان .[1]

---

[1] التبشير و الاستشراق – د. محمد عزت، ص ٨٤ – ٨٧ – ٩٥

# بەشی یەکەم

# پێناسە و ناساندنی ڕۆژهەڵاتناسی

ووشـەی ڕۆژهەڵاتناسـی بـۆ ئـەو لێکۆڵینەوانـە بـەکاردێت، کـە لەلایـەن کەسـانێکەوە ئـەنجام دراون ، کـە خـەڵکی ڕۆژهـەڵات نـین، بـەڵام لێکۆڵینەوەکانیان دەربارەی زانست و زانیاری و زمـان و ئـایین و مێـژوو و بارودۆخی کۆمەڵایەتی ڕۆژهەڵات نووسیوە .

ڕۆژهەڵاتناسـی لـەو کاتـەوە دەسـتی پێکـرد، کـە سـوپای ڕزگـاری موسڵمانان بۆ ڕزگارکردن و فـەتح کـردن لـە دەرگـای ئـەوروپایان دا، لـەو کاتـەدا موسـڵمانان تـەختی پاشـایەتی و گـەورەیی و شـکۆمەندی و پێشـەوایەتی و فـەرمانڕەوایی نێودەوڵـەتیان داگیرکـرد بـوو، ناوبـانگی موسڵمانان گوێی دنیـای پـڕ کردبـوو . ئـەوروپاش لـەم کاتـەدا نقـوومی نەزانی و دواکەوتوویی شارستانی بوو بوون، لەو ڕۆژگارەدا ئەوروپییەکان، دەگـەڕان بـە دووای دۆزینـەوەی هۆکارەکـانی بووژانـەوە و سـەرکەوتنی موسڵمانان و گەیشتنیان بـەو شـکۆمەندییە گـەورە و مەزنـە . هەنـدێك لـە پیاوانی کەنیسەکانی ئەوروپا هەڵسان بە لێکۆڵینەوە و خوێنـدنی (زانسـت و زمـان)ی ئـەو موسـڵمانانەی بـۆ جیهـادکردن و فـەتح کردنـی ئـەوروپا

چوویوون، ئەمەش بە مەبەستی دەستکەوتنی زانست و زانیارییەکانی موسڵمانان و بۆ سوود وەرگرتن لەو زانستانە و ڕزگارکردنیان لەو دواکەوتوویی و نەزانییە، کەواتە ڕۆژهەلاتناسی داواکردنی زانست و زانیاری ڕۆژهەلات بوو.

لەو کاتەدا بزوێنەر و هاندەرانی شەڕی خاچپەرستی، پیاوانی ئایینی نەسرانی و قەشەکان بوون، زانستە بەرزەکانیش لە نێوان قەشەکانی کەنیسەدا قەتیس مابوو، لەسەرەتادا ئەوانەی ڕوویان لە ڕۆژهەلاتناسی کرد، پیاوانی ئایینی و قەشەکان بوون، بێگومان ئامانجیان لەو ڕووتێکردنە ئامانجی شەڕی خاچپەرستی بوو، ئەو شەڕەی شێوازێکی نوێی وەرگرت، یا شێوازێکی نوێ بوو، لە داگیرکردنی ماددی و چەکداری و ئەو ئامانجانەش هاوبەشن، لەگەڵ ئامانجەکانی موژدەدەرەکانی بەگاورکردن، لە پاشان چەندین پەیمانگا و کۆمەڵەیان بۆ ڕۆژهەلاتناسی دامەزراند، کە پێکهاتبوون لە ڕۆژهەلاتناسەکان بۆ هاوکاریکردنی ئەو کارانەی، کە پەیوەستن بە لێکۆڵینەوە و زانستە ڕۆژهەلاتییەکان، وەك بلاوکردنەوەی هەندێك دەستنووسی عەرەبی و دانانی پێڕستی گشتگیربۆ هەندێك کتێبی ئیسلامی، دانانی فەرهەنگ و پێرستی گشتگیر بۆ هەندێك کتێبی ئیسلامی، دانانی فەرهەنگی پێڕست بۆکراو، بەدرێژیی باسی هەندێك ئایاتی قورئانی پیرۆزیان کردووە، بە پێی بابەتەکان. جوولەکەکان ڕۆژهەلاتناسییان بە دەروازەیەکی ترسناك زانیوە، لەو دەروازانەی، کە بتوانن درزە بکەنە ناو ئەو وڵاتانەی، کە خەونی داگیرکردنیان پێوە دەبینی . بە پێی ڕیگەو ڕێبازی خۆیان و دەستەیەکیان بوونە پسپۆر و تایبەتمەند

لە ڕۆژهەلاتناسی و لێکۆڵینەوە ڕۆژهەلاتناسییەکان، لە سەر ڕێ و شوێنی ئەو ڕەوتە ڕۆیشتن بە پێی پیلانی جوولەکە، تا جوولەکەکان توانیان ژمارەیەکی زۆر کورسی خوێندن لە زانکۆ گەورەکان بۆ خۆیان داگیربکەن و

لەم بوارەدا، خزمەتی ئامانج و مەبەستەکانی جولەکەو زایۆنیزمی پێ بکەن، لە ژێر پەردەی خزمەتی ڕۆژهەلاتناسە نەسرانی و ئامادجە داگیرکارییەکان . ڕۆژهەلاتناسی چەند قوتابخانەیەکی جیاوازی هەیە هەر یەك لەم قوتابخانانە ئامانجی تایبەتی خۆیان هەیە، کە دەگونجێ لەگەڵ ئەو ڕێبازە بیریە، یا ئایینی یەی دەچنەوە سەری و شوێنی کەوتوون، دەتوانین ئەو قوتابخانانە بەم شێوەیە دابەش بکەین :

١- قوتابخانە نەسرانییەکان : ئەمەش بۆ دوو بەش دابەش دەکرێن :

أ- کاسۆلیك

ب- پرۆتێستانت

٢- قوتابخانەی یەهودی

٣- قوتابخانەی ئیلحادی گشتی

٤- قوتابخانەی ئیلحادی کۆمەنیستی

هەموو ئەو ئاشوب و فتنانەی دووچاری موسڵمانان بوونەتەوە وایکردووە، موسڵمانان سەرسام بن، بەو شارستانییەتە ماددییەی ڕۆژئاوا، ئەمەش وایکردووە، موسڵمانان، بوونەتە نێچیری نەسرانییەت لەرێگەی فێرکردن و شێوازەکانی فێرکردن و پرۆگرامەکانی ئەمەش پلانێکی زیرەکانە و فێڵبازانەیە، وایانکردووە زانکۆکان لە ولاتە موسڵمانەکان،

پلەزانستیەکانی قەتیس بکرێن، لە سەر هەڵگرانی بڕوانامە لە زانستە مرۆڤایەتییەکان، ئەمەش درێژە پێدانی ڕێنمایەکانی نەسرانییەکانە [1]

هۆکارەکانی سەرهەڵدانی ڕۆژهەڵاتناسی زۆرن، هەیانە هۆکاری ئاینی یە، یاخود ڕامیارییە، یا داگیرکاری یە، یا بازرگانییە، هەشیانە هۆکاری زانستی یە، بەڵام هۆکاری ئایینی، پاڵنەر و هۆکاری یەکەمە بۆ هاندانی ڕۆژئاوایی یەکان بۆ ڕۆژهەڵاتناسی، ڕۆژهەڵاتناسی بە قەشەو پیاوانی ئایینی دەستی پێکرد، ئەوانیش ئەوەیان بە لاوە گرنگ بووە، کە توانج و پەلار و ڕەخنە لە ئیسلام بگرن، جوانییەکان و خووڕەوشتە چاکەکانی ئیسلام ناشرین بکەن و بشێوێنن . ڕاستییەکانی ئیسلامیان گۆڕیوە و هەڵیانگێڕاوەتەوە، بۆ ئەوەی بۆ جەماوەرەکەی خۆیان، بەڵگە بهێننەوە و بسەلمێنن، ئایینی ئیسلام ئایینێکی گونجاو و شایەن نییە بۆ بڵاوبوونەوە

١ أجنحة المكر الثلاثة، عبدالرحمن حبنكه، ص ٨٣- ٨٤ -٨٥

# بەشی دووەم

# ئامانجەكانی ڕۆژهەڵاتناسی و ئامرازەكانی

## یەكەم : ئامانجەكانی ڕۆژهەڵاتناسەكان :

ئامانجـەكانی ڕۆژهەڵاتناســی یـا ڕۆژهەڵاتناســەكان، لـە لێكۆڵینــەوە ڕۆژهەڵاتناسیەكانیاندا دابەش دەبێتە سەر سێ ئامانج

أ- ئامانجێكی زانستی گوماناوی، كە مەبەستیان تێدا ئەمانەیە :

١- گومان خستنە سەر ڕاستی پـەیامی پێغەمبەرایـەتی پێغەمبـەر (صلى الله علیه و سلم).

گومان دروستكردن، لەوەی، كە ئیسلام ئایینێكە، لە لایەن خوداوە هاتووە .

٢- گومان دروست كـردن سـەبارەت بـە فـەرموودەكانی پێغەمبـەر (صلى الله علیه و سلم) .

٣- گومان دروست كردن سەبارەت بە نـرخ و پلـە و پایـەی فیقهـی ئیسلامی.

٤– گومـان دروسـتکردن لەسـەر توانـای زمـانی عـەرەبی و لەگـەڵ ڕەوتی گۆڕانکاری و پێشکەوتن .

ب– ئامانجی ئایینی و ڕامیاری

ج– ئامانجێکی زانستی پـاك و بێگـەرد، کـە هـیچ مەبەسـتێکی تێدایـە نییە، تەنیا توێژینەوە و گەڕان و پشکنین نەبێت .

## أ– یەکەم : ئامانجی زانستی گومانـاوی

١– گومان خستنە سەر ڕاستی پەیامی پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر(صلـى الله علیە و سلم) و سەرچاوە خـوایی یەکـەی، زۆربـەی ڕۆژهەڵاتناسـەکان نکوڵی لەوە دەکەن، کە محمد (صـلى الله علیـە و سـلم) پێغەمبـەر بێـت و لەلایەن خوای گەورەوە وەحی بۆ هاتبێت . سـەیردەکەی لـە لێکدانـەوەی دیمەنەکانی وەحی تێکەڵی و پێکەڵیەکی زۆریان کردووە، ئەوانەی هاوەڵە بـەڕێزەکانی پێغەمبـەری خـوا (صـلى الله علیـە و سـلم) دەیـانبینی، بـە تایبەتی خاتوو عائیشە دایکی ئیمانداران خوا لێـی ڕازی بێـت، هەنـدێك لـە ڕۆژهەڵاتناسـان هـاتنی وەحـی دەگێڕنـەوە ، بـۆ ( فـێ و پەرکـەم )، کـە دوچاری پێغەمبەر (ص)دەبوو، هەندێکیان دەیگێڕنەوە بـۆ خـەیاڵکردن و هەندێکی تریان بە نەخۆشی لێکیانداوەتەوە، وەکو ئـەوەی خـوای گـەورە لـە پـێش ئـەودا هـیچ پێغەمبـەرێکی ڕەوان نـەکردبێت، هـەتا لێکدانـەوەی دیاردە و دیمەنی ( وەحی ) یان ئەوها لەسەر گران و قورس بێت .

ئـــەو ڕۆژهەڵاتناســـانە زۆربـــەیان مەســـیحی و جولەکـــەن دان بـــە پێغەمبەرەکانی ناو ( تەورات )دا دەنێن، کە پلەیان لە( محمد ) (صـلى الله

علیه وسلم) نزمترە[1] رۆلیان کەمترە،کاریگەرییان کەمترە، لە گۆڕینی کۆمەلگا و ڕەوتی مێژوو و بیروباوەڕ، لەبەر ئەوە نکۆلی کردنیان لە پێغەمبەرایەتی ( محمد ) (صلی الله علیه و سلم)، ئەو دەمارگیری بە ئاینی بە نیشان دەدات، کە دل و دەروونی قەشەو پیاوە ئاینی و موژدەدەرەکانی پڕ کردبوو . دوا بە دوای ئەوە نکۆلی لەوە دەکەن، کە قورئان کتێبێکی دابەزێنرلو بێت، لە لایەن خوای گەورەوە کاتێك ئەوەی لەناو قورئاندا هاتووە، لەو ڕاستییە مێژووییانەی لەسەرگەل و نەتەوەکانی پێشوو دەمکوتیان دەکات، کە ئەستەمەو مەحالە لە کەسێکی نەخوێندەواری وەکو پێغەمبەرەوە هاتبێت، ئەوان وەلامت دەدەنەوە.

---

١ هەرچەندە لە عەقیدە و بیروباوەڕی ئیسلامیدا باوەڕکردن بە هەموو پێغەمبەران یەکێکە لە پایەکانی باوەڕ و ئیمان و نابێت جیاوازی بکەین لە نێوان هیچ پێغەمبەرێکدا . هەر وەکو خوای گەورە لە سوڕەتی ( ألبقرة ) فەرموویەتی : (( امن الرسول بما أنزل اليه من ربه والمؤمنون كل امن بالله و ملائكة و كتبه و رسله لانفرق بين أحد من رسله وقالوا سمعنا و أطعنا غفرانك ربنا واليك المصير))﴿ألبقرة- ٢٨٥﴾. واتە ( پێغەمبەری خوا ئیمانی هێناوە بەوەی لەلایەن خوای خۆیەوە بۆی نێردراوە، خاوەن ئیمانەکانیش هەموو ئیمانیان هێناوە بە خوای پەروەردگار و بە فریشتەکانی و بەو کتێبانەی بۆ پێغەمبەران نێرراون، بە دل باوەڕیان هەیە و بەزمان ئیعتراف و ئیقرار دەکەن و دەلێن : ئێمە هیچ فەرق و جیاوازی ناکەین لە نێوان پێغەمبەرانی خوا . هەروەها هەموو گووتویانە ئێمە فەرمانی خوامان بیستووە و وەرمانگرتووە و ملکەچین بۆی، تاوانبەخشی هەر بۆ تۆیە و لە تۆی داوا دەکەین و لە ڕۆژی قیامەتدا بۆ لای تۆ دەگەڕێینەوە و سەرەنجاممان هەر لای تۆیە ).

ئەو لەو کەسانەی وەرگرتووە، کە لە دەوروبەری بوون و هەواڵیان پێدەدا، کاتێکیش ئەو ڕاستی یە زانستیانەی لە ناو قورئاندا هاتوون، کە تازە دۆزراونەتەوە لەم سەردەمەدا، دەمکوتیان دەکات، ئەوان لە وەڵامدا، ئەوە بۆ زیرەکی پێغەمبەر ( ص) دەگێڕنەوە .

٢–لە پاش نکوڵی کردنیان لە پێغەمبەرایەتی پێغمبەر ( ص ) نکوڵی کردن لە ئاسمانی بوونی قورئانە، نکوڵی کردنیانە لەوەی، کە ئایینی ئیسلام ئایینێك بێت لە لایەن خواوە هاتبێت . ئەوان وای دادەنێن ئایینی ئیسلام لە لێکدانی هەر دوو ئایینی مەسیحی و جولەکە دروست بووە، تێبینی ئەوە دەکرێت، ڕۆژهەڵاتناسە جولەکەکان زیاتر لە سەر ئەوە سوورن، کە ئایینی ئیسلام درێژە پێدەری ئایینی جولەکەیە، ئەمەش لە بەر ئەوەی چەند خاڵێکی هاوبەش هەر دوو ئایینی ئیسلام و جولەکە کۆدەکاتەوە .

٣– گومان دروست کردن لە ڕاستی و دروستی فەرموودەکانی پێغەمبەر (صلى الله عليه و سلم)، ئەو فەرموودانەی، کە زانا پشکنەر و لێکۆڵەرەوەکانمان بەجێی متمانەیان داناوە، ئەو ڕۆژهەڵاتناسانە ئەوە دەکەنە بەڵگە، کە فەرموودەی ( دانراو و دروستکراو ) چوونە سەر فەرموودەکانی پێغەمبەر و تێکەڵاوی بوون .

خۆیان لە گێلی داوە و ئەو هەوڵ و کۆششەیان لە بەرچاو نەگرتووە، کە زانایان بەخشیویانە و داویانە ، لە پێناو پاککردنەوەی فەرموودە ڕاستەکانی پێغەمبەر (صلى الله عليه و سلم) لە فەرموودە ناڕاستەکان، بەپشت بەستن بە چەند یاسایەکی زۆر ورد لە لێکۆڵینەوە و گەڕان و

پشکنین، کە لە ئایینەکانی لای ئەوان زانراو نەبوون، لە دەیا یەکیش لەم یاسایانەیان نەزانیوە، بۆ دڵنیا بوون لە ڕاستی و دروستی کتێبە پیرۆزەکانی خۆیان .

ئەوەی وای لێکردوون، ئەو قسە زیاد و بێ سەروبەرانە بکەن، ئەوەیە، سەیریان کردووە، کە فەرموودەکانی پێغەمبەر چ سامانێکی هەزری وتەشریعی و یاساداناني سەرسوڕهێنەری تێدایە . ئەوان باوەڕیان بە پێغەمبەرایەتی ( محمد ) (صلى الله عليه و سلم) نییە و بۆیە بانگەشەی ئەوە دەکەن، ئەوە لەگەڵ عەقڵ ناگونجێ، ئەو فەرموودانە لە پێغەمبەرێکی نەخوێندەوارەوە هاتبێت . گرێی دەروونی لای ئەوان بریتی یە لە باوەڕ نەکردن بە ( محمد ) (صلى الله عليه و سلم) و پێغەمبەرایەتی ( محمد ) (صلى الله عليه و سلم) هەموو ئەو گومان وخەیاڵو تێکەڵ و پێکەڵیەیان، لەوەوە سەرچاوە دەگرێت .

٤- گومان دروست کردن سەبارەت بە نرخ و پلە و پایەی فیقهی ئیسلامی، ئەو تەشریع و یاسادانانە گەورە و مەزنەی، کە هەرگیز وەکو ئەو کۆنەبوونەتەوە بۆ هیچ نەتەوەیەك لە نەتەوەکان و لە هیچ سەردەمێك لە سەردەمەکانی مێژوودا. بانگەشەی ئەوەیان کردووە ( کە لە بەدرۆخستنەوەی پێغەمبەر سەرچاوەی گرتووە ) فیقهی ئیسلامی درێژەپێدەری فیقهی ڕۆمانی و پاشان درێژەپێدەری فیقهی ڕۆژئاواییەکانە و لەوانیان وەرگرتووە، بەڵام زاناکانمان دەمکوتیان کردوونەتەوە و سەلماندوویانە، کە فیقهی ئیسلامی فیقهێکی سەربەخۆیە لە خودی خۆیدا

و درێژەپێدەری هیچ فیقهێکی تر نییە و لە هیچ فیقهێکی تر سەرچاوەی نەگرتووە .

٥- گومان دروستکردن لە توانای زمانی عەرەبی لەگەڵ ڕەوتی گۆڕنکاری و پێشکەوتنی زانستی، ئەمەش بەو مەبەست وئامانجەی وامان لێبکەن، کە لە هەزاری بمێننەوە و پێویستمان بە زاراوەکانی ئەوان هەبێت، کەوامان لێبکات هەست بە چاکە و دەسەڵاتی ئەدەبی ئەوان بکەین و وا نیشان بدەن زمانی عەرەبی زمانێکی هەژارە بەرامبەر بە ئەدەبەکەی ئەوان، ئەمەیش جەنگی ئەدەبی یە، شان بە شانی داگیرکاری سەربازی لەگەڵمانی دەکەن

## ب- دووەم : ئامانجی ئایینی و ڕامیاری

ئەم ئامانجە لەم خاڵانە کورت دەکەینەوە :

١- دروست کردنی گومان لای موسڵمانان بەرامبەر بە پێغەمبەرەکەیان و قورئانەکەیان و شەریعەتەکەیان و فیقهەکەیان لەمەشدا، دووئامانجیان هەیە، یەکیان ئایینیە ویەکیان داگیرکارییە هەیە.

٢- بەگومان خستنی موسڵمانان بەرامبەر بە نرخ و بەهای کەلەپوور و سامانە شارستانیەتەکەی خۆیان . بانگەشەی ئەوە دەکەن، کە شارستانەیەتی ئیسلامی لە شارستانیەتی ڕۆمانی وەرگیراوە، عەرەب و موسڵمانەکان هیچیان نەبووە، تەنیا فەلسەفەی ئەو شارستانیەتەیان وەرگێڕاوە و لەبەریان گرتۆتەوە و لاسایی یان کردۆتەوە، لەگەڵ ئەمەشدا ، کە شارستانیەتەکانی خۆشیان، پڕە لە کەموکوڕی .

٣- لاوازکردنی متمانەی موسڵمانان بەکەلەپوری خۆیان، بڵاوکردنەوەی گیانی بە گومان سەیرکردنی هەموو ئەو شتانەی لەبەردەستیاندایە، لە خوورەوشت و بیروباوەڕ و عەقیدە و نموونەی باڵا .

٤- لاوازکردنی گیانی برایەتی لەنێوان موسڵماناندا، لە هەموو وڵاتەکاندا لە ڕێگەی ژیاندنەوەی هەستی نەتەوایەتی و ڕەگەزپەرستی، ئەو هەستەی لە پێش ئیسلامدا هەبوو، وروژاندنی ناکۆکی و دووبەرەکی لە نێوان گەل و نەتەوەکان، لە وڵاتە عەرەبییەکانیش هەمان سیاسەت پەیڕەو دەکەین . هەوڵدەدەن و تێدەکۆشن بۆ ئەوەی یەککگرتوو نەبن و پەرتەوازە بن، قسەیان یەك نەبێت، بەهێنانی ڕووداوێکی تاکە کەسی لە مێژوودا، بۆ ئەوەی مێژوویەکی نوێی لێ دروست بکەن .

## ج- سێ یەم : ئامانجی زانستی پاك و بێگەرد، کە هیچ مەبەستێکی تێدا نییە، تەنیا توێژینەوە و گەڕان و پشکنین نەبێت .

لێکۆڵینەوە و توێژینەوە لە کەلەپوری عەرەبی و ئیسلامی هەندێك ڕاستی نهێنی و پەنهانی بۆ ئاشکراکردوون . لێکۆڵینەوەی لەم جۆرە، کەبەدوای توێژینەوەو لێکۆڵینەوەی ڕاستیدا دەگەڕێن ژمارەیان زۆر کەمە. ئەو لێکۆڵینەوانەی،کە زۆر بەپاکی و دڵسۆزیش ئەنجامدراون ڕزگاریان نەبووە، لە هەڵە و کەمو کوڕی و بەدەستەوەدانی دەرئەنجامی دوور لە ڕاستی، ئەمەش یان لەبەر ناشارەزاییانە، لە شێوازەکانی زمانی عەرەبی، یان ناشارەزایی و نەزانیانە بەرامبەر بەبار و دۆخی مێژووی ئسلام، بە

جۆرێك بیریان لە كۆمەڵگای موسڵمانان كردۆتەوە، هەر وەك چۆن بیر لە كۆمەڵگاكانی خۆیان دەكەنەوە، ئەوەیان لەبیر چووە، كە جیاوازی سروشتی و دەروونی لە نیوان ئێمە و ئەواندا هەیە .

ئەم توێژە، ئەم كۆمەڵەیە، بێ زیانترین توێژن لە ناو هەر سێ توێژەكاندا، لە ڕووی ئامانجەوە مەترسیان لە هەموویان كەمترە، چونكە خێرا دەگەڕێنەوە بۆ حەق و ڕاستی، كاتێك ڕاستیان بۆ دەردەكەوێت هەندێكیان بە دڵ و دەروون و بیر و باوەڕەوە، تێكەڵی ئەو ژینگەیە دەبن، كە لێكۆڵینەوەی لەسەر دەكەن و لە گەڵیدا دەژین، ئەمەش وا دەكات ئەنجام و دەرەنجامێكی وایان دەست دەكەوێت، كە لەگەڵ حەق و ڕاستیدا دەگونجێ و هاوتا دەبێ . بەڵام لەلایەن خاوەنی دوو ئامانجەكەی پێشوو سەر زەنشت دەكرێن و دووچاری تەنگ پێهەڵچنین دەبنەوە، هەر زوو تاوانبار دەكرێن، بەوەی كە لە پەیڕەوی زانستی لایانداوەو بە دوای سۆز و عاتیفە كەوتوون و موجامەلە و زمان شیرینی بەرامبەر بە موسڵمانان دەكەن . هەروەكو چۆن بەرامبەر ( تۆماس ئارنۆلد )كردیان،كاتێك نوسەری ناوبراو بەرامبەر بە موسڵمانان بە ئینساف و دادپەروەر بوو . لە كتێبە بەناوبانگەكەی ( بانگەواز بۆ ئیسلام ) بەڵگەی زۆری هێناوەتەوە لەسەر بەخشندەیی و سنگ فراوانی موسڵمانان لە سەردەمە جیاوازەكاندا بەرامبەر بەو كەسانەی لەڕووی ئاینیەوە لەگەڵیان جیاوازبوون. ڕۆژهەڵاتناسەكان دەربارەی نووسەری ناوبراو گوتویانە : ((كتێبەكانی بە پاڵنەرێكی بەهێزی سۆز و خۆشەویستی بۆ موسڵمانان نوسراوە ))، هەندێك لەو نوسەرانەی، كە لێكۆڵینەوەكانیان بە دڵسۆزی و

بە پاکی لە پێناو گەیشتن بە ڕاستی نوسیوە، لە کۆتاییدا بوون بە موسڵمان و بەرگرییان لە ئیسلام کردووە ، لە ناو گەل و نەتەوە پۆژئاوایی یەکانی خۆیان، هەروەکو چۆن پۆژهەڵاتناسی فەرەنسی هونەرمەند (دێنیە) کردی، کە لە جەزائیر ژیاوە و سەرسام بووە بە ئیسلام و موسڵمان بوونی خۆی ڕاگەیاند، کتێبێکی هەیە

(تیشکێکی تایبەت بە ڕوناکی ئیسلام) لەو کتێبەدا چۆنیەتی هەڵسوکەوتی گەلەکەی لەسەر ئیسلام و لەگەڵ پێغەمبەرەکەی روون کردۆتەوە، ڕۆژهەڵاتناسی فەرەنسی لە فەرەنسا کۆچی دوایی کردووە، لە جەزائیر بە خاك سپێردراوە[1]

## دووەم : ئامرازەکانی ڕۆژهەڵاتناسان بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانیان

ڕۆژهەڵاتناسەکان هیچ ئامراز و هۆکارێکیان پشت گوێ نەخستووە، بۆ بڵاوکردنەوەی لێکۆڵینەوەکانیان و بڵاوکردنەوەی بیرو ڕاکانیان، هەموو ڕێگە و ئامراز و هۆکاریان بەکارهێناوە . لەو هۆکارانە :

١- دانانی کتێب لەسەر بابەتی جۆراوجۆر دەربارەی ئیسلام وڕەوتە ئیسلامییە جیاوازەکان و پێغەمبەرەکەیی و قورئانەکەی، لە زۆربەی ئەو کتێبانەشدا گۆڕین و لادان بە ئەنقەست و بە مەبەست بەدی دەکرێن و

١ الاستشراق والمستشرقين،د .مصطفى السباعي، ص ٢٠-٢٥

دەبینرێن لە گواستنەوە و وەرگێڕانی دەقەکان ، یان تێگەیشتن لە واقیعی مێژوویی و هەڵێنجان و دەرهێنانی ئەنجام لەم واقیعە .

٢- دەرکــردن و بڵاوکردنــەوەی گۆڤــاری تایبــەت بــە توێژینــەوە و لێکۆڵینەوەکانیان دەربارەی ئیسلام و وڵاتە ئیسلامییەکان و گەلەکانیان .

٣- نــاردنی نێــردراوە موژدەدەرەکــان بــۆ جیهــانی ئیســلامی بــۆ ئەنجامدانی هەندێك کار، کە لـە ڕواڵـەت و ڕووکەشـدا کـاری مرۆڤایـەتی و مرۆڤدۆستین، وەك کردنەوەی نەخۆشخانە و کۆمەڵە و قوتابخانـە و لانـەی بێ دایك و باوکان و خانەی میوانداری وەك ( کۆمەڵەی لاوانی مەسیحی ) .

٤- گوتنەوەی موحازەرات لە زانکۆ و کۆڕ و کۆمەڵە و ناوەندە زانستی یەکان، جێ ی داخە لە هەموویان ترسناکتر و دوژمنکارانە تر بـۆ ئیسـلام ئــەو موحازەراتــەن، کــە لــە زانکــۆ عەرەبییــەکان و ئیســلامییەکان دەوترێنەوە، لە قاهیرە و دیمەشق و بەغدا و ڕیبـات و کەراچـی و لاهـور و عەلیکرە و شوێنەکانی تر، کە تێیدا قسە لەسەر ئیسلام دەکەن .

٥- بڵاوکردنــەوەی وتــار لــە ڕۆژنامەکانـدا، لـەم بوارەشـدا توانیویانـە ژمارەیەکی زۆر لە ڕۆژنامە ناوخۆییەکان بە پارە بکڕن و بە کرێ بگرن، لە وڵاتە ئیسلامیەکاندا، موژدەدەرەکان وا ڕادەگەیەنن توانیویانە ئیستغلالی ڕۆژنامەگــەری بکــەن ، بەتایبــەتی ڕۆژنامــە میســرییەکان بــۆ دەربڕینــی بیروباوەڕی مەسیحی، زیاتر لە هەر وڵاتێکی تـر، موژدەدەرەکـان ڕۆژنامـە ناوخۆییەکانی خۆشیان پشت گوێ نەخستووە، بەڵکو ئەوانیشیان ( قـۆرغ ) ئیستیغلال کردووە، بۆ پڕوپاگەندەکردن بۆ گاوری و مەسیحیەت .

٦-بەستنی کۆنگرە بۆ قایمکردن و پتەوکردنی نەخشە و پیلانەکانیان، ئەو کۆنگرە و کۆبوونەوانە لە ڕواڵەتدا خۆیان وا نیشان دەدەن، کە لێکۆڵینەوەی گشتین، لە ساڵی ( ١٨٧٣ )وە، تا ئێستاش ئەم کۆنگرانە دەبەستن .

٧-دانان و دروستکرنی ئینسکلۆپیدیا و دەریا ی زانیاری ( دائرە المعارف )ی ئیسلامی، بلاوکرنەوەی بە چەندین زمانی جیاواز، لەم ئینسکلۆپیدیایەدا کۆمەڵێکی زۆر لە گەورە ڕۆژهەڵاتناسان بەشداریان لە نوسینەوە و دارشتنی داکردووە، بەتایبەتی ئەوانەی زۆر دژی ئیسلامن ، ژەهریان خستۆتە ناو هەنگوینەوە و پڕیان کردووە لە قسەی پووچ و بێ بنەما دەربارەی ئیسلام، ئەوەی جێی داخە، ئەم ئینسکلۆپیدیایە بۆتە سەرچاوەی زانیاری زۆرێك لە ڕۆشنبیرەکانمان، بەم پێیەی بەسەرچاوەیەکی جێی متمانەی دادەنێت بۆ بەڵگە هێنانەوە لە کاتی قسەکردندا . ئەمەش یەکێکە لە دیاردەکانی نەزانی و بێ ئاگایی، بەرامبەر بە ڕۆشنبیری ئیسلامی[1]

---

١ الاستشراق والمستشرقین،د.مصطفی السباعي، ص ٢٦ – ٢٧

# بەشی سێیەم

# گۆڕەپانەکانی ڕۆژهەڵاتناسی و کاریگەرییەکانی

ڕۆژهەڵاتناسی سەرەتا بە لێکۆڵینەوە لە زمانی عەرەبی و ئیسلام دەستی پێکرد، بەڵام کۆتایی هات لە پاش فراوانبوونی داگیرکاری ڕۆژئاوا لە ڕۆژهەڵات، لێکۆڵینەوە لە هەموو ئایینەکانی ڕۆژهەڵات و داب و نەریت و جوگرافیای ئەو وڵاتانە و دیارترین زمانەکانی ئەو گەلە ڕۆژهەڵاتیانە، لەگەڵ ئەوەشدا گرنگی دان بە ئیسلام و ئەدەبیاتی عەرەبی و شارستانیەتی ئیسلامی لە گرنگترین ئەو بابەتانە بوون، کە ڕۆژهەڵاتناسەکان گرنگییان پێداوە، تاکو ئەمڕۆش بە پێی ئەو پاڵنەرە ئاینی و ڕامیاریانەی هاندەربوون بۆ لێکۆڵینەوە ڕۆژهەڵاتناسیەکان .

وڵاتە داگیرکەرەکانی وەك بەریتانیا و فەڕەنسا، تا ئێستاش سوورن لەسەر ئاڕاستەکردنی ڕۆژهەڵاتناسی بە ئاڕاستە کۆن و تەقلیدیەکەی، بەم پێیەی ئامرازێکە بۆ ڕوخاندنی ئیسلام و لەکەدارکردن و شێواندنی ناوبانگی موسڵمانان . لە فەڕەنسادا، تاکو ئێستاش ڕۆژهەڵاتناسە پیرە فەڕەنسییەکان لەکاتی ئێستادا وەکو شارەزا (خبیر) لە وەزارەتی دەرەوەی فەڕەنسا بۆ کاروباری عەرەبی و ئیسلامی کاردەکەن . لە وڵاتی

ئینگلتەرا دا، ڕۆژهەڵاتناسی شوێن و پلە و پایەی ڕێزداریان هەیە، لە زانکۆکانی لەندەن و ئۆکسفۆرد و کامبردج ئەدنبەرە و گلاسکۆ و ئەوانی تریش .

جولەکە و ئینگلیز و داگیرکار و مزدەدەرەکان سەرپەرشتی ئەو ناوەندانە دەکەن، سوورن لەسەر ڕەتکردنەوەی هەر نامەیەکی دکتۆرا، کە ناوەڕۆکەکەی دادپەروەر بێت بەرامبەر بە ئیسلام ، یان میانڕەوبێت بەرامبەر بە ئیسلام و پیلانی ئەو ڕۆژهەڵاتناسانە ئاشکرا بکات .

جێی سەرسوڕمانە، کە زۆر لە ئوستادە ڕۆژهەڵاتناسەکانی ئەوروپا لە وڵاتە عەرەبی و ئیسلامیەکان کاریان دەکرد، بەڵام ئێستا سوید و هۆڵەندا و ئەڵمانیا و ئوسکوتلەندا و وڵاتەکانی تریان پڕکردووە . هیچ گومانی تێدانییە، کە مزدەدەرەکان لە تێکدان و شێواندنی بیروباوەڕ و عەقیدەی موسڵمانان بەتەواوی شکستیان هێناوە، بەڵام دەتوانن بەم ئامانجە بگەن لە ڕێگەی زانکۆکانی ڕۆژئاوا بەتایبەتی ئەو زانکۆیانەی، کە قوتابی و خوێندکاری موسڵمانەکان بە مەبەستی تەواوکردنی خوێندن ڕوویان تێدەکەن .

ئەوانیش ئەو قوتابی و خوێندکارانە هەڵدەبژێرن، کە لە سروشت و خۆڕسکدا لاوازن و کەسایەتیەکی شێواویان هەیە و ڕەفتار و خووڕەوشتێکی لەڕێ لادەرانەیان هەیە. کورسی خوێندنیان پێدەدەن و بڕوانامەشیان پێ دەفرۆشن بە هەر نرخێك بێت، بۆ ئەوەی ئەو قوتابی و خوێندکارانە ببنە مزدەدەری نادیار .

زانکۆکانی ڕۆژئاوا کاردەکەن لە سەر پەروەردەکردنی ڕۆژهەڵاتییەکان بۆ پلە و پایەی زانستی و بڕوانامە، بۆ ئەوەی ئیستغلالی ئەو قوتابی و خوێندکارانە بکەن وەکو موژدەدەر و وتاربێژ و مامۆستا کار بۆ ئامانجەکانی ئەوان بکەن .

ئەم کارەش لە ژێر ناوی ڕاهێنان و فێرکردنی موسڵمانان ئەنجام دەدەن . سەیردەکەی ئەو زانکۆیانە بڕوانامەی بەرز دەبەخشنەوە و نازناوی زانستی دەبەخشن بۆ کەمترین توێژینەوە و لێکۆڵینەوە، کە ئەنجامی دەدەن، ئۆ ئەوەی بیکەنە تۆڕێکی داپۆشراو بۆ ڕاوکردنی ڕۆڵەی موسڵمانان بۆ خستنە ژێربارو ڕاوکردنیان بۆ خزمەتکردنی موژدەدەری و نەسرانییەت، بێ ئەوەی هەست بە خۆیان بکەن، دەگەڕێنەوە بۆ وڵاتەکانی خۆیان، دڵ و دەروونیان پڕبووە لە غرور و لەخۆبایی بوون، ئەمە جگە لەوەی دووچاری بوونەتەوە لە گۆڕانی هەڵسوکەوت خووڕەوشت، لە ئەنجامی ژیان لە ناو ژینگەی کۆمەڵگا ڕۆژئاواییەکاندا . لە ماوەی بە دەستهێنانی بڕوانامە دووچاری فیتنە بوون .

لە ئەنجامی بینینی ڕوخسار و ڕواڵەتی شارستانیەتی ماددی ڕۆژئاوا.[1]

یەکێك لەو شوێنەوارانەی، کە ڕۆژهەڵاتناسەکان بەجێیانهێشتووە و کاریگەرییەکی زۆر گەورەی لەژیانی موسڵمانان بە گشتی و عەرەب بەتایبەتی کردووە، ئەویش کارکردنە لەسەر دژایەتی کردنی زمانی عەرەبی

١ أجنحة المكر الثلاثة، عبدالرحمن حبنكه، ص ٨٧

بڵاوکردنــەوەی زمــانی ( عــامی )، ڕۆژهەڵاتناســەکان درکیــان بــەوە کردووە، ناتوانن پەیوەندی نێوان موسڵمانان و عەرەب بپچڕێنن، تــاوەکو یەك زمان هەبێت هــەموو عــەرەب کۆبکاتــەوە و موســڵمانانیش بگرێتــەوە، تــاوەکو نوســین بــە پیتــی عــەرەبی هــەبێت و ئێســتای موســڵمانان بــە کەلــەپوری ڕابــوردووی پــڕ ســەروەریان ببەســتێتەوە، بــۆ ئــەم مەبەســتە ڕۆژهەڵاتناسەکان نەخشەو پلانێکیان داڕشت . کە ئامانج تێیدا ئەم خاڵانە بوو :

١-هانــدانی هــەر دەوڵــەتێکی عــەرەبی بــۆ نوســین بــە زمــانی (عامیــە) (ڕەمەکی) گشتی، ئەو زمانەی، کە تاکەکانی، قسەی پێدەکەن .

٢-دانانی پیتی لاتینی لە شوێنی پیتــی عــەرەبی، لــە پشــتی ئــەم دوو ئامانجــەش چــەند مەبەســت و مــەرامێکی بــەهێز لــە دڵ و دەروونــی ڕۆژهەڵاتناسەکاندا هەیە، بەو هیوایە بوون، کە عەرەب پەیوەندی بپچڕێنن بە قورئانی پیرۆز و جوغز و چوارچێوەی خوێندن و خوێندنەوەی قورئــانی پــیرۆز بچــووك ببێتــەوە و تەســك ببێتــەوە، تــاوای لێ دێــت تــەنیا لەمزگەوتەکان دەخوێندرێتەوە، هــەروەکو چــۆن زمــانی لاتینــی تــەنیا لــە کەنیسە کاسۆلیکیەکان دەخوێندرێتەوە.

هیوا و ئــاواتی ڕۆژهەڵاتناســەکان ئەوەیــە، کــە قورئــان ببێتــە کتێبێك هیچ پەیوەندی بە ژیانەوە نەبێت، تەنیا ژمارەیەکی کەم لە موسڵمانان لــە ناو مزگەوتەکاندا بیخوێننەوە و بێ ئەوەی هــیچ شــتێکی لێ تێبگــەن و بــێ ئەوەی هەست بەو شتە بکەن، کە لە ناوەڕۆکەکەیدایە .

شـایانی بەبیرهێنانەوەیـە، ڕۆشـنبیری ئیسـلامی لـە سـەر دوو پایـەی سەرەکی دەوەستێت :

١- ئایین بە زانستە جۆراوجۆرەکانی

٢- زانست بە هونەرە زانراوەکانی

بـۆ ئـەم مەبەسـتە فەڕەنسـا هەوڵیـدا لـە جـەزائیر عەرەبـەکان لـە زمانەکەیان دابڕێت، ئەویش بە دەرکردنیان لە قوتابخانە و دیوانەکان .

ئینگلتـەڕا وەك نـەریتی زیرەکـی و فێڵبـازی خـۆی، دەسـتی کـرد بـە دژایـەتی کردنـی زمـانی یـەکگرتوو و پـاراوی عـەرەبی، ئەمـەش بەبانگەوازکردن بۆ زمانی (عامیە) هانـدانی فەرمانبـەران و مـوژدەدەران و ڕۆژهەلاتناسـەکان، بـۆ قسـەکردن بـە زمـانی (عامیـە)، جـا ئەگـەر زمـانی (عامیە) چالاك و بەهێزبوو، لە ولاتە عەرەبیەکاندا، لـە بەرامبەریـدا زمـانی پاراو یەکگرتووی عەرەبی دەبەزێت، ئەو کاتەش تێگەیشتنی نێوان هەموو عـەرەب دەبێتـە شـتێکە مـەحاڵ بـیر و بـاوەڕ و عەقیـدە لاواز دەبێـت، پەیوەندییەکان دەپچڕێن، یـەکێتی ویـەکگرتوویی دەبێتـە پەرتـەوازەیی و جیابوونەوە، هێزەکان پەرتەوازە و بلاودەبنەوە، ئەو کاتـەش داگیرکـەران دەتوانن پاروو پاروو بیانخۆن و قووتیـان بـدەن، بـەلام ئـەم بانگـەوازە شکستی هێنا، بەلاوازبوونی داگیرکاری لە ڕۆژهەلاتـدا بـە هێـزی هوشـیاری لای عەرەب و موسڵمانان، موسڵمانان لە بۆسەدا وەسـتا بـوون ، بـە وردی چاودێری هـەر کەسێکمـان دەکـرد، کـە بەنـەزانی ، یـان هـەوا و هـەوەس

هەلیخەلەتاندبێت و بیەوێت گالتە بە زمانی ئیسلام بكات، یان بیشێوێنێت و هەولی لاوازكردنی پردی پەیوەندی نێوان عەرەب بدات.[1]

رۆژهەلاتناسانەكان لە هەولّ و تێكۆشاندان بۆ نكولی كردنی محمد (صلی الله علیه وسلم)، بانگەشەی ئەوە دەكەن، كە قورئان وتەی خوای پەروەردگار( الله)(جل جلاله) نییە، رایدەگەیەنن، كە ئایینی ئیسلام لە ئاسمانەوە دانەبەزیوە لەم رێگەیەشدا مشتومڕ و گفتوگۆیەكی زۆر دەكەن، بێ ئەوەی یەك بەلگەیان بە دەستەوە بێت خاوەنی یەك بەلگەبن، كە توێژینەوە و لێكۆلینەوەی زانستی دروست، ئەو بەلگەیە پشت ڕاست بكاتەوە و پشتگیری لێبكات، لەگەلّ ئەوەی، كە ڕۆژئاوا ئەو هەموو پێشكەوتنە شارستانیەتە مادديیەی بەدەستهێناوە، خوای گەورە دەربارەیان ڕاستی فەرمووە : ((وما یجادل فی ایات الله ألا الذین كفروا فلا یغررك تقلبهم فی البلاد))﴿غافر- ٤ ﴾

واتە (ناكەوێتە دەمەدەم و بەر پەرچدانەوە لەبارەی ئایەتەكانی خواوە، كە ناردونیەتە خوارەوە بۆ سەر پێغەمبەرەكانی تەنیا ئەوانە نەبێ، كە كافرن، لەبەر ئەوە گەڕان و هاتووچۆیان بە ولاتاندا لە خشتەت نەبات و وابزانی ئەمانە كۆمەلێكی بە خێرن و هەرگیز لە بەزین نایەن ) .

[1] التبشير والاستشراق، د. محمد عزت، ص١٢٩

# بەشی یەکەم

## پێناسەی داگیرکاری

موژدەدان و ڕۆژهەلاتناسی دوو کۆڵەکەو پایەن لەکۆڵەکە و پایەکانی داگیرکاری.

بەکرێگیراوانی موژدەدان و ڕۆژهەلاتناسی، بەکرێگیراوانی داگیرکەرانن و لە خزمەتی سیاسەتی ئەواندان، ئەگەرچی لەڕواڵەتیشدا خۆیان بە بەرگریکار لە دژی داگیرکاری نیشانبدەن وەولّی ڕزگارکردنی ولاتەکەیان بدەن لە ژێر دەستی داگیرکەر.

موژدەدان و ڕۆژهەلاتناسی وداگیرکاری لەنێوان خۆیاندا بەرنامەی کارەکانیان دابەشکردووە، بەپێی پیلانێکی گشتی بڕیار لەسەردراو، بۆداگیرکردنی ولاتانی ئیسلامی وموسڵمانان، ڕۆژهەلاتناسی کارکردن لە بواری زانست وزانیاری وئەکادیمی خستە ئە ستۆی خۆی. موژدەدان کارکردن بۆبانگەوازی جەماوەری خستە ئە ستۆی خۆی.جا ئەگەر ئەو دوو دەستەیەی پێشوو( موژدەدان و ڕۆژهەلاتناسی) توانیان ئامانجەکانی خۆیان بپێکن، ئەوا دەستەی سێیەم(داگیرکەر) بەئاسانی دەتوانێت ولاتی موسڵمانان داگیربکات، بێ هەوڵ وکۆششێکی ئەوتۆ، کە شایەنی باسکردن بێت .

وشەی (الاستعمار)لە وشەی (العمارە) ئاوەدانكردنەوە وەرگیراوە، هەروەكو خوای گەورە دەفەرموویت : ﴿هو أنشأكم من الارض واستعمركم فیها﴾ (هود : ٦١)

واتە((خودا ئێوەی لەزەویدا بەرپاكردووە و دروستكردووە و داوای لێكردوون زەوی ئاوەدان بكەنەوە)).

داگیركەران كاتێك باروئۆخی موسڵمانانیان زانی و لە باروئۆخی ولاتی موسڵمانانیان كۆڵییەوە و زانیان، كە چ سەروەت وسامانێكی زۆریان هەیە، ئەو خاكەی بە درێژایی گەلە موسڵمانەكان و ولاتە ئیسلامییەكان درێژ دەبێتەوە، سەراپای پڕە لە خێروبێری ئابووری و رامیاری وسەربازی، دەمیان ئاوی پێدا دەهاتە خوارەوەو بە چاوی نێچیرسەیری خێروبێری ولاتی موسڵمانانیان دەكرد، هەموو هەوڵێكیان چڕكردەوە بۆ دەستبەسەرداگرتنی گەنجینەكانی ژێرزەوی وئیستغلالكردنی هەرچی بتوانن ئیستغلالی بكەن، دەستەمۆكردن وڕامكردنی هێزی مرۆیی موسڵمانان(هێزی كاری موسڵمانان )، ئەوانەی لەسەر خاكی خۆیان دەژین، بەكارهێنانیان بۆ خزمەتی ئامانجە بەرژەوەندیخوازەكانی خۆیان، لەگەڵ شاردنەوەی شارەزایی وهونەری خۆیان لەموسڵمانان، بۆ ئەوەی موسڵمانان بێبەش بكەن لەو شارەزاییانە.

ئەمەو داگیركەران پێش ئەوەی ولاتە ئیسلامییەكان داگیربكەن مۆژدەدەرەكان ودامودەزگاكانیان لە پێشدا ڕەوانەی ئەو ولاتانە كردووە، ئەوانیش زۆر بە دڵ فرلوانییەوە كۆمەكییان كردن ویارمەتییان دان،

بۆئەوەی ببنە بناغەو بنچینەی یەکەم بۆ جێبەجێ کردنی ئامانجە داگیرکارییەکانیان.

هەروەها ڕێگەیان خۆشکرد بە توێژینەوەو لێکۆڵینەوەی ڕۆژهەلاتناسەکان، پاشان توانیان بچنە ناو پایتەختە گەورەکان لە ولاتە ئیسلامییەکان، ئەمەش بە ئیستغلال کردنی، ئەو دارمان وداڕووخانە ڕێژەیی یە ناوخۆ و دەرەکییەی موسڵمانان دووچاری ببوون وپێی گەیشتبوون، لە ئەنجامی لەدەستدانی هوشیاری ئیسلامی گشتی ولادانی خەڵك ودووركەوتنەوەیان لە زانستە ئایینی یەکان و زانستە گەردوونییەکان و سەرقاڵبوونیان بە بوارەکانی بازرگانی وکشتوکاڵ لەسەر شێوازی کۆن(تقلیدی)، بێ ئەوەی شتێکی نوێ لە پێشکەوتن وچاککردنی بخەنە سەر، ئەمەش بووە هۆکارێکی یارمەتیدەر بۆ داگیرکەران بۆ پیلانگێران لە دژی موسڵمانان لەئەنجوومەنە نێودەولەتییە گەورەکان وبەکرێگیراوەکانیشیان لە ناوەوەی ئەو ولاتانەدا بە کاردەهێنا بۆ جێبەجێ کردنی پیلانەکانیان.(1)

[1] اجنحة المكر الثلاثة،ص ١٢٢

# بەشی دووەم

# ئامانج وئامرازەکانی داگیرکاری

## یەکەم : ئامانجەکانی

لەو شتانەی زۆر ڕوون وئاشکراو و زانراون، یەکێك لەهۆکارەکانی شەڕی خاچپەرستی، لەڕواڵەتدا هۆکاری ئایینی بوو، ئامانج تیایدا، سەندنەوەی بەیتولمەقدیس(بیت المقدس)بوو لەدەستی موسڵمانان، بەڵام لە ڕاستیدا ئەم شەڕە هۆکارێك بوو بۆ دەست بە سەر داگرتنی ڕۆژهەڵاتی ئیسلامی وئەوەی تیایدایە لە خێروبێرە ئابوورییەکان وناوەندە سەربازییەکان.

بانگەشەکەرانی دڵسۆزی داگیرکەر، وەکو بانگەشەکەرانی نهێنی وپەنهانییەکانی مژدەدەرەکان، هیچ وەعدوبەڵێن وپەیمانێکیان نابەنە سەرو ڕێزو کەرامەتی خەڵك ناپارێزن.لەمەوە بۆمان ڕوون دەبێتەوە و دەردەکەوێت، کە مژدەدەرەکان وڕۆژهەڵاتناسەکان بەیەك دەگەنەوە، لە دژایەتی کردنی ئیسلام وڕێگە گرتن لەبانگەواز کردن بۆئیسلام وهەوڵدان بۆ ڕووخاندنی بناغەی ئیسلام، هۆکاری بەیەك گەیشتنی ئەو سێ دەستەیە (داگیرکەرومژدەدەروڕۆژهەڵاتناسەکان) بۆ دژایەتی کردنی ئیسلام ڕوون وئاشکرایە، زۆر پێویستی بە قووڵبوونەوەوتێڕامان ناکات،

***ئیسلام عەقیدە و بیروباوەڕێکی ڕاستە و ئامۆژگاری ورێنماییەکانی ڕووناک وپڕشنگدارن و بانگەوازێکی مرۆڤایەتییە، کاریگەری خۆی هەیە، لە دەروونی پەیڕەوکەران وەدەست پێوەگرانی، کەواتە ئیسلام ئەو بەربەستەیە، کە بەرامبەریان دەوەستێت ولێناگەڕێت ئامانج وتەماعە داگیرکارییەکانیان بەدی بێنن، هەروەکو چۆن ئیسلام هێزێکی جوڵێنەربوو، بۆ بەربەرچدانەوەی شەڕو هێرشەکانی خاچ پەرستان لەپێشوودا. تاوایان لێهات ناچاربن رازی ببن بەدەستکەوتەکانیان وبگەڕێنەوە بۆ وڵاتەکانی خۆیان وتەنیا ڕق وکینەیان بەمیرات بۆمایەوە بەرامبەر بە ئیسلام.***

١–لەبەرئەوە ئامانجی ڕاستەقینەیان، ئەو ئامانجەی، کە زەحمەتی بۆدەکێشن وهەوڵدەدەن لەپێناویدا، گەیشتنە بە لەناوبردنی ئیسلام بەیەکجاری وسڕینەوەی ئیسلام لە بووندا.

٢–یەکێك لەو هۆکارانە دەروونییانە ی، هانی تاوانبارانی جەنگ دەدات، بۆدەست بەسەراگرتن وداگیرکردنی وڵاتە ئیسلامییەکان، حەزوئاواتی گەورەیانە لەدەستەمۆکردن وڕامکردنی گەل ونەتەوە ئیسلامییەکان لەکاری وەبەرهێنان وشتی تریش، وەك کاری کشتوکاڵی وپیشەسازی وئاوەدانکردنەوە، یان کاری خزمەتگوزاری، لەهەمووشیان گرنگتر بەکارهێنانیانە لەکاری شەڕوجەنگدا .ڕۆڵەکانی گەل ونەتەوەژێردەست وبەزیوەکان بەزۆر دەکەنە سەربازو بەکاریان دەهێنن بۆ شەڕکردن لەدژی گەلانی تر.

٣-ئامانج وئارەزووی داگیرکاری لەفراوانبوون وفراوانخوازی لە زەوی موسڵمانان بۆ نیشتە جێکردن وسوود لێوەرگرتن، هەندێك جار ئەو ئاوات وئارەزووەیان بۆ بەدی نایەت بە ڕازیکردنی خاوەنی ڕاستەقینەی زەوییەکان، داگیر کەران هیچ ڕێگەیەك نابیننەوە بۆگەیشتن بەم ئاواتەیان، تەنیا ڕێگای زوڵم وستەم ودەستدرێژی نەبێت، بۆ دەست بەسەرداگرتنی خۆراك وبژێوی ژیان و زەوتکردنی زەوی و زاری موسڵمانان.

٤- ئاوات وئارەزوویان، لە تۆڵە سەندنەوە لە موسڵمانان، بۆ ئەوەی دڵیان ئاو بخواتەوە و هەناسەیەك بدەن، لەسەر ئەو ڕق وکینەیەی بەمیرات بۆیان ماوەتەوە

بە رامبەر بەموسڵمانان، هەروەکو لەپێشترباسمان کرد، لە ئەنجامی دۆڕان وشکستیان لە شەڕی خاچپەرستیدا. ئەو ڕق وکینە کۆنەیان لە دڵ ودەروونیاندا هەڵگرتووە وحەزدەکەن وئاواتەخوازن، تۆڵە لە موسڵمانان بکەنەوە.

٥-کۆمەڵێك هۆکاری دەروونی کۆبوونەتەوە، هانی تاوانبارانی جەنگ دەدەن بۆ داگیرکردن و دەست بەسەرداگرتنی و لاتی موسڵمانان، هەروەکو ئەوە ی داگیرکەران وموژدەدەران و ڕۆژهەلاتناسان لە دژی ئیسلام وبیروباوەڕ و عەقیدەکەی لەسەری کۆبوونەتەوە. سەیر دەکەیت باڵی سیاسی وسەربازی ئەو دەوڵەتانەی چاوی تەماع وداگیرکارییان بڕیوەتە خاکی موسڵمانان بەرەو ئاڕاستەی داگیرکردن و دەست بەسەرداگرتنی خاکی موسڵمانان چوون، سەیر دەکەیت کۆمەڵ و گروپێکی تر (موژدەدەرەکان)لەگەڕدان ودەڕۆن بۆ غەزوکردنی بیری و

فیکــری، سێیەمیشــیان لەگەڕدایــە ودەڕوات بۆغــەزوکردنی زانســتی و ڕۆشــنبیری، ئــەوانیش ڕۆژهەڵاتناســەکانن . بەمــەش هەرســێ ئامانجەکــە کۆدەبنەوە، بۆوردوخاشکردنی موسڵمانان و لەبەریــەك هەڵوەشــاندنەوەی یەکێتی ویەکگرتنی موسڵمانان ولاوازکردنیان .

## دووەم : ئامرازەکانی بەدیهێنانی ئامانجەکان

١-سیاسەتی داگیرکاری پەنادەباتە هەموو ئامرازێك بـۆ خزمـەتکردنی ئامانجەکانی، بۆئەم مەبەستە سوودیان لەپیاوانی ئـایینی نیشـتیمانپەروەر وەرگرتووە، هەروەها سوودیان لەو بێگانانەش وەرگرتووە، کە هاتوونەتە ڕۆژهەڵات. سەرت سـوڕدەمێنێ کاتێـك سـەیر دەکـەیت وڵاتێکـی عـەلمانی وەکو فەڕەنسا دژایـەتی ئـایین وکۆمەڵـە ئـایینی یـەکان دەکـات لـە وڵاتـی خۆیدا، لەهەمان کاتدا یارمـەتی وکۆمـەکی کۆمەڵـە ئـایینی یـەکان دەکـات لەدەرەوەی وڵاتی خۆیدا.

٢-لــەپاش بڵاوبوونــەوەی ئیســلام لەڕۆژهەڵاتــدا، کەنیســـەی نەسرانییەکان کەمبوونەتەوە، لەئەنجامدا وەکو دوورگەی بچووك بچووکیان لێهات لەناودەریایەکی فراوانی دەورەدراودا. ئەو کەنیسانە لەگـەل ژمـارە کەمیشـیاندا، دوژمنکـارو ڕقەبـەربوون، تەنانـەت لـەکاتی نوێژەکانیانـدا ولەکاتی قسەو گوتارەکانیاندا زمانی جیاوازیان بەکارهێناوە وەك عـەرەبی وسریانی ویۆنانی، لەگەڵ تێپەڕبوونی ڕۆژگاردا ئەم دوژمنکارییـە ڕووی لـە زیادبوون کردووە و پاشان دارمـانی خوڕەوشـتی وئـابووری لەناوکەنیسـەو دێرەکــانی بــەدوای خۆیــدا هێنــا، بۆیــە یەکــەم شــت داگیرکــەران

ومۆژدەدەرەکان بیریان لێکردۆتەوە، بریتی بووە لە چاکسازی لەناو ئەو کەنیسانەدا وبەکارهێنانیان بۆ مەبەستی کاری مۆژدەدەری، ولاتە بیانییەکانیش باش دەزانن، کەتەنیا بەمەبەستی مۆژدەدان نەهاتوون، بەلکو بەمەبەستی دەستبەسەرداگرتنی رامیاری وسیاسی هاتوون، مۆژدەدانیش تەنیا ئامرازێکە بۆگەیشتن بەم ئامانجە، بۆیە یەکەم لێکۆلینەوەو خوێندنەوەی مۆژدەدەرەکان بریتی بوو لەلێکۆلینەوە لەو لایەنانەی کەخزمەتی داگیرکاری دەکات.دەستیانکرد بە لێکۆلینەوە لە بارودۆخی سیاسی ورامیاری لە جیهانی ئیسلامی دا، کاتێک بینیان بارودۆخەکە جۆرێك لەپشێوی و ناجێگیری تێدایە، گوتیان ئەمە ئامازەیە بۆ زۆری ئەو دەرگاو دەروازانەی لەسەر پشتن ودەمانگەیەنن بەجیهانی ئیسلامی.

زۆربەی ولاتە ئەوروپییەکان چالاکی مۆژدەدانی سیاسی ورامیاریان هەبوو، فەرەنسا قەشەو راهیبەکانی لەولاتی (سوریاولوبنان)دەردەکرد و پاشان لەدەرەوە(واتە لە فەرەنسادا)باوەشی بۆ دەکردنەوە، بۆ ئەوەی ئارەزووە داگیرکارییەکانی بۆ بەدی بێنن .

٣–داگیرکەر وئیستعمار کاتێك ولاتێك داگیردەکەن ودادەبەزنە ولاتێك، دۆست وهاوکارەکانی خۆیان لەو کەمە نەتەوانە پەیدا دەکەن، کە دانیشتووی رەسەنی ئەو ولاتە نین وغەوارەن.کاتێك داگیرکەران ولاتەکانی رۆژهەلاتی جیهانی ئیسلامییان داگیرکرد، پشتیان بە ئەرمەن وئاشووری وکۆچەرەکانی جوولەکەو روسی و یۆنانی وفەرەنجییەکان(فەرەنسییەکان) دەبەست بۆ ئەوەی دژایەتی عە رەب وموسلمانانی پێبکەن.

٤-داگیرکەران فەرمانبەرانی دەولەتیان لە موسڵمانان هەڵنەدەبژارد، موسڵمان دەبوو هەمیشە کەمینە بن، لە هەموو ئەو دامودەزگایانەی ملکەچی داگیرکەران بوون وسەر بە ئیستعمار بوون، پاشان جگە لەوەی موسڵمانەکان کەمینە بوون لەدامودەزگاکانی دەوڵەتدا، هەرگیز پلەو پایەوسەرۆکایەتی بەڕێوەبردنی کاروباریان پێنەدەدرا.[1]

٥-سووربوون و پێداگری داگیرکەران لەسەر ئەوەی، کە کەمینە نەتەوەوئاین ومەزهەبەکان هەرگیز ڕێک نەکەون لەگەڵ زۆرینەی موسڵمانان لە ڕۆژهەلاتدا.

٦- داگیرکەران پیلانەکانیان ئاراستەی نەوەکانی داهاتووش دەکەن، ئەو نەوانەی تازە پێدەگەن بۆ ئەوەی لە هەموو ڕوویێکەوە بەرەو خەراپەو بەدرەوشتیان ببەن، بەم پێیەی ئەم نەوە تازە پێگەیشتووە، وەکو لاپەرەیەکی سپی وان، ئامادەباشیان تێدایە بۆ ئەوەی بکەونە ژێرکاریگەری داگیرکەران، چونکە ئەمانە (ئەوەی دواڕۆژن)(نەتەوەی سبەینێ)ن.

وردە وردە ڕۆڵەی موسڵمانان نزیك دەبنەوەو دەچنە ڕیزی سوپای داگیرکەران وسەنگەری داگیرکەران، بێ ئەوەی چەکیشیان بەدەستەوە بێت، ئەوانیش خوڕەوشتی ئەو موسڵمانانە تێکدەدەن و وایان لێدەکەن، لە وڵاتی خۆیان تووشی غەریبی و نامۆیی بێن.

---

[1] التبشير والاستعمار في البلاد العربية،ص ١٦٠-١٦٨

٧–داگیرکـــەران زۆر بەهانـــە و پاکانـــەی بـــەدرۆیان هێناوەتـــەوە، بۆشـــاردنەوەی ئامانجـــە ڕاســـتەقینەکانی خۆیـــان و ئەوجولانەوانـــە ی ئەنجامیان داوە. لەو بەهانانە ی، کە داگیرکەران دروستیان کـردووە، وەك ڕێبازیـك بۆدەسـت بەسـەرداگرتنی گـەل ونەتـەوەکان لـەماوەی سـەدەی نۆزدەهـەم و سـەدەی بیسـتەمدا. لەوانـە : بانگەشـەی شارسـتانییەت وئاوەدانکرنـەوە و فێرکـردن و یارمەتیـدانی تەندروسـتی وکۆمەڵایـەتی. هەموو ئەمانەش تەنیا دروشم بوون و ئامانج و مەبەسـتە ڕاسـتەقینەکەیان پێدەشاردەوە.

٨– داگیرکـەران ئـاگری دووبـەرەکی خۆشـدەکەن وهـانی ڕقەبـەری دەدەن، بۆئەوەی هێرشە داگیرکارییـە دوژمنکارییـەکانیان لەبـەرگێکی بـە ڕەوشت وئەدەبدا یان لەجلوبەرگی تۆڵەسەندنەوەدا بێت.

بەم شێوەیە وێنەوشێوەی ئەو دەست بەسـەرداگرتنە مادییـە چـەپەڵ وگلاَو و پیس وچاوچنۆکییەیان شێواندووە و لەژێر چەند دروشم و شـێوەو شێوازێکدا ، ئەو ڕقوقینەیان شاردۆتەوە.(١)

[1] اجنحة المكر الثلاثة،ص٥٧٨

# بەشی سێیەم

# گۆڕەپانەکانی داگیرکاری وکاریگەرییەکانی

## یەکەم: گۆڕەپانەکانی

مرۆڤــی شارســتانی ومەدەنییــەتی نــوێ، نموونەیــەکی وای نیشــاندا لەداگیرکردن، هاوشێوەی ئەوەی مرۆڤی سەدەکانی کۆن نیشانیانداوە و پێشکەشیان کردووە، بێ ئەوەی جیاوازییــەکی جەوهــەری گــەورە وگــرنگ لەنێوانیاندا هەبێت، تەنیا جیاوازی لە ئامرازەکانی هــەردوو ســەردەمەکەدا هەیە. هەردوو داگیرکارییەکە لەسەر چەوساندنەوە و زەلیل کردنی مرۆڤ لە لایەن مرۆڤی برابیەوە دامەزراون، بێ ئەوەی هیچ هەقێکی ڕەوای هــەبێت، یان ئامانجێکی نموونەیی هەبێت.

کاتێــك دەگــەڕێین بــەدوای هۆکــاری ئــەو دەســتدرێژی ودوژمنکــاری وداگیرکارییــەدا، ســەیردەکەین هــیچ پاڵنــەرێك وهانــدەرێك بــۆ ئــەو دوژمنکارییە نابینینــەوە، تــەنیا خۆپەرستی وخۆویستی تاکەکەسی یــان کۆمــەڵ نــەبێت، یــاخود دەروون تــاریکی وچاوچــنۆکی نــەبێت، یــاخود ئەوئارەزووە دامــەزراوەی لــەدەروونی کەســی خۆســەپێندا هەیــە.یان ئــەو گەڵ ونەتەوانــەی شــانازی بــە تــاوان دەکــەن و خۆپەرســتی وخۆویســتی و چاوچــنۆکی و ئــارەزووی هاوبــەش تیایانــدا گەشــەی کــردووە و هــەوڵی

جێبەجێکردنی ئەو ئارەزووانە دەدەن، بە چەوساندنەوەی گەلانی ترو زەلیل کردن و ژێردەستکردن وبەکۆیلەکردنیان.

کاتێك ولاتانی ئەفریقیایان داگیرکرد، ئەو ولاتانەی ملکەچی داگیرکەران بوون، بۆمان دەرکەوت تا چ رادەیەك داگیرکەران دەنگوباسی ئەو ولاتانە لەئێمە دەشارنەوەو راستییەکی زۆر گرنگیش بەدەرکەوت، ئەویش ئەوەیە داگیرکەران بروایان وابوو(سائیبەو نەسرانییەکان)مەیل ولایەنگریان زیاتر بۆ ولاتە رۆژئاواییەکان دەبێت، بەلام شکستیان خواردو بێ هیوا بوون، لێرەشدا ئەندازەی پەیوەندی بەتینی نێوان موژدەدەران وداگیرکەران بەدیاردەکەوێت.

لە ولاتی (مەغریب)دا داگیرکەری فەرەنسی دانیشتوانەکەی دابەشکردبوو بۆ دوو بەش(موسلمانەکان)و(ئەوروپییەکان). مەبەستمان لە بەشی دووەم ئەو خەلکانەن، کە دانیشتووی رۆژهەلاتن، بەلام ئایینیان (نەسرانییە)یان (جولەکەیە) ئەو ئەوروپییانە شوێن وپلەوپایەی زۆرباش ونایابیان هەبوو، لە سیاسەت وکارگێری وبەرێوەبردن وکۆمەلگادا، هەرچی موسلمانەکانن لە هەموو شتێکدا وەکو کۆیلە مامەلەیان لەگەلدا دەکرا.

لە ولاتی (سودان) ی رۆژهەلاتدا، کە دانیشتوانەکەی زیاتر موسلمانن حکومەتی (میسر)یش بەگاورکردنی لەناو موسلمانەکاندا حەرام وقەدەغە کردبوو، راهیبەکان دوچاری کوشتن ولەناوبردن دەبوونەوە.

کارەکە بەم شێوەیە مایەوە تا (ئینگلیزەکان) هاتن و(میسر)یان داگیرکرد، پاشان هێرش وهەلمەتی (ئینگلیزی–میسری)بۆسەر(سودان)

دەسـتی پێکـرد، بەمەبەسـتی کوژاندنـەوە و لـەناوبردنی بزوتنـەوەی (مەهدی)، لەوکاتـەوە چالاکی موژدەدەرەکـان لە(خـەرتووم) فراوانبـوو. هەرچـی باشـوری سـودانە بۆموسـڵمانەکان یاسـاغ وقەدەغـە بـوو بچـنە ناوباشوری سودانەوە، بۆئەوەی ڕێگا بۆ موژدەدەرە مەسیحییەکان خۆش بێت، بۆئەوەی بەئازادی کاری تێدا بکەن، باشوری سـودانیش لـەو کاتـەدا بتپەرست و (وثنیە گی)تەواو بوون و ببـووە گۆرەپـانی ململانـێ لـەنێوان بزوتنەوە ئیسلامییەکان لەلایـەك و نێـردراوە مـوژدەدەرە مەسـیحییەکان لەلایـەکی تـرەوە، بێگومـان سـەربەخۆیی( سـودان) کاریگـەری موژدەدەرەکانی لەسەر باشوری سودان زۆر کەمکردەوە.

هەرچـی موسڵمانەکانی(حەبەشـە)(ئـە ثیوپیـا)ی ئێسـتایە، لەلایـەن حکومەتەوە زۆر بەتوندی دژایـەتی دەکـران، دوچاری توندوتیـژی ئـایینی بوونـەوە، تـا ئـەو ئەندازەیـەی حکومـەتی (حەبەشـی)توانی لەڕێگـەی زۆر لێکردنەوە چـەند موسـڵمانێك بکەنـە گـاور، بـەلأم ئەوشـێوازەیە، ململانـێ ودووبەرەکی ودوژمنکاری نێوان موسڵمانان ومەسیحییەکانی زیاتر کرد.

سەرت سوڕدەمێنێ کاتێك سـەیر دەکـەیت نەسـرانییەکان لـە حەبەشـە کەمینـەن، بـەلأم داگیرکـەر بەتایبـەتی داگیرکـەری بـەریتانی، پاڵپشـتی بنەماڵـە مەسـیحییە فـەرمانڕەواکانی دەکـرد، فـەرزی دەکـردن بەسـەر موسڵمانەکان، هەرچەندە موسڵمانەکان زۆرینەش بوون، لەکاتێکدا زۆربەی نەسـرانییەکانی حەبەشـە بەعـەرەبی قسـەیان دەکـرد. لـەپاش جـەنگی دووەمـی جیهـانی داگیرکـاری (بـەریتانی-ئـەمریکی)زوڵمێکی تریشـیان زیـادکرد وخسـتیانە سـەرزوڵمە کۆنـەکانیان، (ئەریتریا)شـیان

خستەسەرولاتی (حەبەشە)و وایان لێكردن ملكەچی بنەماڵە فەرمانڕەوا مەسیحییەكانی حەبەشە بن .

هەرچی دەربارەی داگیركەرانە لە(ئاسیا) بۆ نموونە (فەڕەنسا) تایفەگەری بەرهەمهێنا وداهێنا بۆ جێبەجێ كردنی مەرامەكانی، تا وای لێهات ئەو تایفەگەرییە بووە خۆراكێك بۆ لەدایك بوونی داگیركەرێكی تاوانبار.

گرنگی دان و دەست تێوەردانی فەڕەنسا لە(لوبنان) زیادی دەكرد، هەرچەندە گرنگی دان و دەست تێوەردانی بەریتانیا لە ڕۆژهەلات زیادی كردبا، بەریتانیا مەرام وئامانجی تریشی هەبوو لەم بەشەی جیهاندا، گرنگی زۆر بە(سوریا) دەدا بەتایبەتی دوای ئەوەی (هیند)و(ڕۆژهەلاتی ئاسیا) بوونە دوو تەوەرە، بۆ سەروەت وسامانی بەریتانیای داگیركەر، بەم شێوەیە داگیركەران شەڕی عەرەب و موسڵمانانیان كردووە.

ئەو شتەی زۆر سەخت وناخۆشەو جێگەی داخە، ئێمە دەیبینین و ڕووبەڕووی دەبینەوە، ئەوەیە هەندێك جار داگیركەران لەم ڕێگەیەدا كەسانێك لەخۆمان بەكار دەهێنن، دەست ناپارێزن لەكڕینی ویژدان و ئاوەژووكردنەوەی ڕاستییەكاندا.[1]

[1] التبشير والاستعمار في البلاد العربية،د.مصطفى خالدي،و عمر فروخ.ص١٥٢

## دووەم : کاریگەرییەکانی داگیرکەر

زۆر شێوازی بەد ڕەوشتی لەژیانی زۆربەی گەل ونەتەوە موسڵمانەکاندا بلاوبۆتــەوە، ئەوگــەل ونەتەوانــەی کەوتبوونــە ژێرچــەپۆکی داگیرکــەران، ئەمەش بە کاریگەری وکارتێکردنی ئەوحکومەتانەی، کە ئـەو ولاتانـەیان بـەڕێوە دەبـرد . .ئەوحکومەتانـە لـە مامەڵـەکردنیان لەگـەڵ ئـەو گـەل ونەتەوانەدا شێوازێکی ناپەسەند وبێ ڕەوشتییان بە کاردەهێنا، وەکو درۆ وخیانەت وپەیمان شکاندن وناپاکی کردن ودەست بـڕین وبـێ وەفـا بـوون بەرامبەر بە وەعد وپــەیمان وبــەرتیل خــواردن و..............هتـد لـەم جۆرە ڕەوشتە نزمانە .

ئـەم ڕەوشـتە نزمانـە لـە داگیرکـەران وحکومەتـە بـە کرێگیراوەکانیـان کاردانەوەی هاوشێوەی هەبوو لە ژێردەستەکانیاندا، ئـەم کاردانەوانـە لـە یەکەمجاردا وەکو چەکێکی ڕووبەڕووبوونەوە گەل ونەتەوەکان ڕووبـەڕووی سیاسەتی داگیرکـەران بوونەتـەوە، بـەلام بەتێپـەڕ بـوونی کـات ودووبـارە بوونەوەی ئـەم کردەوانـە، وای لێهـات کاردانـەوەکان بوونـە خووڕەوشـتی وەرگیراوو بەدەستهاتوو، لە ڕێ لادانی ڕەوشـتی تـوانی زاڵ بێـت بـە سـەر دەروونەکانــدا وتــوانی دەســت بگرێــت بــە ســەر زۆربــەی دیــاردە خووڕەوشــتییەکاندا، شـێوازی درۆ کـردن جێگــەی ڕاسـتگۆیی گرتــەوە، شـێوازی خیانـەتکردن شـوێنی وەفـا وپـەیمانی گرتـەوە، شـێوازی کڕینـی ویژدانەکان بلاوبۆوە.

ئــەم نەخۆشـــی ودەردو پـــەتا کۆمەلآیەتییـــە لـــەناو دامودەزگـــا حکومییەکاندا تێپەڕیوە، گەیشتۆتە ئـەو کەسانەی خـەریکی سیاسـەتن، پاشان گەیشتە بازاڕەکانی بازرگانی کردن وپاشان گەیشتە ناوخێزانـەکان وپەیوەندییە مـاددی وئەدەبییـەکانی نێـوان تاکـەکان، تـا وای لێهـات ئـەو پەروەردەیەی منالّەکانی لە سـەر پـەروەردە دەکرا، پشـتی دەبەسـت بـە زۆرێك لەم جۆرە شێوازە بەد ڕەوشتی وبیّ ڕەوشتییانە.

تـــاوای لێهـــات نـــەوەکان ئـــەو لادانـــە ڕەوشـــتییانەیان لـــە ژینگـــە کۆمەلآیەتییـــەکان وەردەگـرت ولــە ژیــانی ڕۆژانەیانـدا پیادەیـان دەکـرد وجێبــەجێیان دەکـرد. ئــەم گــەل ونەتەوانــە گەنجینەیــەکی زۆرگــەورەی خووڕەوشتی بەرزو بەڕێزو بەپێزیان لەدەستدا، کە بەمیرات بۆیان مابۆوە، ئەو ڕەوشتانەی ئایینی ئیسلام کـاری لەسـەر قولّکردنـەوەوڕەگ داکوتـانی کردووە، لە دەروونی موسلّماناندا.

ڕووخانــدن وتێکــدان زۆر ئاســانە وبــەرووبووم وبەرهەمەکەشــی زۆر بــە خێرایی دێتەدی، بەلآم ئەوەی زۆر قـورس وسـەخت ودژوارە، دروسـتکردن وبونیادنانە.[1]

[1] اجنحة المكر الثلاثة، د. عبدالرحمن حبنكه،ص٢٧٩

ئیسلام ڕووبەڕووی هێرش وپەلاماری بیری و فیکری و ڕەوشتی، یەك لەدوای یەك بۆتەوە، هەروەکو چۆن موسڵمانانیش چ وەکو تاکەکەس وچ وەکودەستەوکۆمەڵیش ڕووبەڕووی ئەوپەلامارانە بوونەتەوە.

پێغەمبەری بەڕێز ڕاستی فەرمووە، کاتێك فەرموویەتی : ((یوشك أن تداعى عليكم ألامم كما تدعا الاكله إلى قصعتها))[1]

واتە((نزیکە گەل ونەتەوەکان بنیشنە سەرتان و گەلەکۆمەکیتان لێبکەن و هەروەکو چۆن کۆمەلە خەڵکێکی چلێس بانگهێشتی یەکتر دەکەن بۆ سەر خوانی نانخواردن)).

ئەوهێرش وپەلامارانەی ئایینی ئیسلامیان کردۆتە ئامانج، زۆرن، جیاواز لە هەوڵەکانی نەسرانییەکان. سەیردەکەین زایۆنیزم وجوولەکە داگیرکەری هاوکارو هاوپەیمان لەگەڵ جولەکەو نەسرانییەکان، بەشدارن لەم هێرش وپەلامارانە. هەموو ئەم هەوڵانەش بۆ بڵاوکردنەوەی تیۆرەکانی دژ بەئیسلام بوو، وەکو (کۆمەنیستی )لێرەدا هەوڵی هەندێك لەو کۆمەلەو گرووپانە دەخەینە ڕوو، کە بەهەمان ئەو ڕۆڵە هەڵدەستن، کە موژدەدەرەکان پێی هەڵستاون.

---

[1] لخرجه ابو داود ڤ سننه (٤/٤٨٣ الرقم ٤٢٩٧)لە فەرموودەکەی(ثوبان)ڕەزای خوای لێبێت .

زایۆنیزم بزووتنەوەیەکی چەپەڵی تێکدەرە، ئامانجی لەناو بردنی بیروباوەڕ وخورەوشتی، هەموو ئەو کەسانەیە، کەجوولەکە نین. یەکێك لەقۆناغەکانی دامەزراندنی دەوڵەت بوو، بۆ جوولەکە لەوڵاتی (فەلەستین)ی خاکی عەرەب وموسڵمانان، بەلام قۆناغەکانی تری بریتی یە لەخزمەتکردنی جوولەکەی جیهانی، تاوای لێدێت جیهان هەمووی دەکەوێتە ژێردەسەلاتی جوولەکە، بەموسڵمان و ناموسڵمانەوە، هەروە کو لە شۆڕشەچەواشەکاری و ساختەکانیان بانگەشەی بۆ دەکەن.

بۆئەوەی زایۆنیزم باش بناسی، بەئەندازەو قەبارەی ڕاستەقینەی خۆی و ئەو مەترسییانەی بۆسەر ئیسلام و گەل ونەتەوەکانی سەر زەوی دروستی کردووە. بەشێوەیەکی گشتی، تێبینی دەکەی جوولەکە سەرچاوەی هەموونەو فیتنەوئاژاوەو پشێویانەیە. کاتێك قەیرانی ئابووری کاریگەری دروستدەکات لە هەموو شوێنێك، ڕێگە بۆ جوولەکە ئاسان دەبێت، بۆ ڕووخاندنی خورەوشت ونەخلاق. بەتایبەتی لەڕێگەی ئافرەتەجوولەکەکانەوە، لە جل وبەرگ وشێوەو ڕوخسارو وێنەی ئافرەتی فەڕەنسی وئیتالی و..........هتد ئەوئافرەتانە بوونەتە هۆی بلاوکردنەوەی ڕووتی وبێ ئابڕوویی و پەردەلابردن لەسەربێ ئابڕویی لە ژیانی سەرکردەی نەتەوەو ولاتەکان .

ئەمە زایۆنیزمە، گرنگترین کۆلەکەیە لەکۆلەکەکانی هێرش وپەلاماری هزری وفیکری بۆ سەرئیسلام و موسلمانان، بۆئەم مەبەستەش هەموو ڕێگایەك دەگرێتە بەر و لە هەموو بوارەکاندا هەوڵدەدات ئیسلام بشێوێنێ و ناشیرینی بکات، مێژووی شارستانییەتەکەی و تێکدانی ڕەوشت

ودروستکردنی کێشە وئـاریش و دەردەسـەری ونانـەوەی فیتنـەو ئـاژاوە و پشێوی .

بەئاگایی بێت یان بێ ئاگایی و نەزانی.، توانیویانە چـەندین موسـڵمان ڕابکێشنە ناو دامودەزگاو ڕێکخراوەکانیان، وەك (ماسۆنییەت) و(ڕوتاری)و چالاکییە کۆمەلایەتییەکان ووەرزش و..............هتد.

لەپێشـترو ئێستاشـدا ئـەم شـوێنانە وەکـو کارگەیـەك بـوون بـۆ بەتاڵکردنەوە ی هزروبیرو فەلسەفە ڕووخێنەرەکان وڕێبازە گـومڕاو لـە ڕێ لادەرەکانیان، ئاڕاستەکردنی ئەم گورزانە بۆ لێدانی جیهـانی ئیسـلامی، لەم پێناوەشدا هاوکاری لەگەڵ نەسرانییە تدا کردووە، تائەو ئەوندازەیەی زۆر لەجوولەکـەکان دەچـوونە نـاو ئایینـە جیاوازەکـانی جیـاواز لـەئایینی خۆیان بۆ هەڵخەڵەتاندنی خە ڵك ولەپێناو گەیشتن بەئامانجەکانیان.[1]

## هاوکاری داگیرکەران لەگەڵ زایۆنیزم وموژدەدەرەکان دژی ئیسلام

گومـانی تێدانییـە، هاوکـاری داگیرکـەرو ئیسـتعمار لەگـەڵ زایـۆنیزم وموژدەدەرەکـان وڕۆژهەلأتناسـەکان و ڕۆژهەلأتناسـی دا، بەمەبەسـتی گەیشـتنە بـە ئامانجـەکانی ودەسـت بەسـەرداگرتنی جیهـانی ئیسـلامییە دەسـت بەسـەرداگرتنێکی سیاسـی وشارسـتانی، ئەگـەر بۆیـان نـەکرابێت

[1] الغزو الفكري، د.علی عبدالحلیم محمود، ص ١٣٢

وبۆیـان ئاسـان نـەبوو بێت لـەڕووی سـەربازییەوە ئـەم ولاتـە ئیسـلامییانە داگیربکەن .

داگیرکـــەر توانیویـــەتی بـــەهۆی دەســـەلاتەکەیەوە، پارێزگـــاری لەموژدەدەرەکان بکات، پاکانە وبەهانە بهێننەوە بۆ ئەو خراپەکارییانـەی دەیکەن، هەروەك چۆن توانیویـەتی وێرانکـاری وکاولکـاری بکـات لەولاتـە ئیسلامییەکاندا، ئەوەی پێی کرابێت لە وێرانکاری درێغی نەکردووە، کـورد گوتەنی: ((ئەوەی لە دەستیان هـاتووە کردوویانـە))(وەرگێر)، هـەروەك چـۆن توانیویـەتی هـانی زۆر کـەس بـدات بـۆ ئـەوەی بچـنە نـاو ئـایینی مەسـیحییەوە وپێـدانی ڕەگەزنامـەی بێگانــە وبیـانی، هـــەروەك چـۆن توانیویـــەتی ژیـــانی موســـلمانان ڕەنگڕێـــژ بکـــات، بـــەڕەنگ وشـــێوەی شارستانییەتی ڕۆژئاوایی، زۆر لەموسلمانان گۆڕان و هەلگەڕانەوە و بوونـە پشتیوان ولایەنگروشوێنکەوتووی ئـەم شارسـتانییە ڕۆژئاواییـە و خـەلکی ئەم شارستانییەتە.[١]

دوژمنێکی تر، کە بەبیروباوەڕیکی نوێ بـۆ مـرۆڤ بەدیارکـەوت، بریتـی بووله(کۆمۆنیزم) مرۆڤ لە ژێر سایەوسێبەری کۆمۆنیسـتیدا، وردوخاشـکراو و پلیشـــاوەیە، لـــەنێوان(مطرقـــة والســـندان) (چـــەکوش ودەزگـــا ی ئاسنگەریدا)چەکوشی توێژی دەسەلاتدارو فەرمانڕەوای هەلبژێردراو لەیەك حزبدا و لـەنێوان دەزگـای ئاسنگەری(سـندان)ی قاعیدەوبنکـە و ناوەنـدی حیزب.

جوولەکـە و یەهودیـەتی، ناپـاك بـەدایکی کۆمەنیسـتی دادەنرێـت، کۆمەنیستی بەچاودێری دایکی توانی پارچە پارچە بێت، بەش بەش بێـت،

هەرپارچەویەشێکیش تـوانی پارێزگـاری لەتایبەتمەندییـەکانی ئەسـڵ وبنچینەکەی بکات. ئەگەرچی لەنێوان ئەوبەش وپارچانەدا کێشەوململانێی توند ڕوویداوە، کەئامانجیان لەناوبردنی مرۆڤایەتییە، نەك خودی ئەو کەسانەی ململانێیەکە دەکەن.

کۆمۆنیزم لەساڵی١٩١٧ هاتە سەردەسەلات و دەستی بەسەر ڕوسیا و هەندێك وڵاتـی ئیسلامیداگرت، ئەو وڵاتانەی لەژێر دەسەڵاتی ڕوسیای قەیسەریدا بوون، هەرچەندە (لینین)ڕایگەیاند، کە ئازادی بەموسڵمانان دەدات، بـەڵام درۆی کـرد، موسـڵمانەکانیش بەرهەڵسـتی حـوکم و فەرمانڕەوایی کۆمۆنیزمیان کرد، ئەو حوکمەی گوررزی زۆر کوشندەی

لـە موسـڵماناندا، تـاوای لێهـات ملیۆنـەها کـەس وڵاتـی خۆیـان بەجێهێشت، لە پێناوی پاراستنی ئاینەکەیان وئازادییان، پـەنایان بۆ وڵاتانی ئیسلامی هێنا، وەکو کیشوەری هیندی وئەفغانستان وئێران و هەندێك وڵاتی جیهانی عەرەبی .دەیان هـەزار کـەس پـەنایان بۆ(مەککەی پیرۆز)و(تائیف)و(مەدینەی منەوەرە)هێنا، گەرەکی (مسقەلە)زۆر قەرەباڵغ بـوو، بـەهۆی هـاتنی هـەزاران پەنابـەر بـۆی لـە (بوخارا)و(تاشـقەند)و (قەفقاس)ەوە.

تەماع وچاوچنۆکی کۆمۆنیزم تەنیا بە وڵاتە ئیسلامییەکان نەوەستا، هەر وڵاتێك کۆمۆنیستی تێدا باڵادەست بووبێت، زۆر بەتوندی فشاریان خستۆتە سەر موسڵمانان، کاتێك لە وڵاتی(حەبەشە)(ئەسیوپیا)ی ئێستا، نیزامی حوکم و فەرمانڕەوایی گۆڕاو، بوو بەکۆمۆنیستی، موسڵمانان بـە سوپا لێیاندرا، بەهەمان شێوەش لە موسڵمانانی (ئەریتریا) درا، هـەمان

کاریان ئەنجامدا لە (ڤێتنام)ی باشوور ولە(تورکمانستان)، کە هەردوو کۆمەنیستی (ڕوسی ) وکۆمەنیستی (چین )ی لە نێوان خۆیاندا دابەشیان کردبوو، ئێستاش ڕوسیا پیلانەکانی تەواودەکات و پیلانی تۆکمەی دادەڕێژێت بۆ دەست بەسەرداگرتنی (ئەفغانستان) بەدروستکردنی حوکمەتێکی بەکرێگیراو دەستی پێکرد[1] بۆئەوەی هێزودەسەلات ونفوزی درێژبێتەوە، بۆگەورەترین ناوچەکانی جیهانی ئیسلامی هەرکاتێك بۆی بگونجێت.[2]

لەگەڵ تێپەڕینی ڕۆژگاردا، تەماع وچاوچنۆکی وچاوتێبڕینی کۆمەنیستی لە جیهانی عەرەبی زیادیکرد، کاتێك (جەمال عەبدولناسر)دەرگای جیهانی عەرەبی بە ڕووی کۆمەنیستیدا کردەوە، وەکو هاوڕێیەك کۆمۆنیزمی هێنایە ژوورەوە . وای لێهات کۆمۆنیزم لەهەموو ولاتە عەرەبی و ئیسلامییەکان لەئەفریقیادا چالاکی پەیدابکات، هەروەها لەولاتەکانی ئەمریکای لاتینیش چالاکی کۆمۆنیزم زیادی کرد، بەلام ولاتە ئیسلامییەکان لەهەموو ولاتەکانی جیهان زیاتر دووچاری لێدان بوونەتەوە، لەلایەن کۆمۆنیزمەوە، تا نۆرە گەیشتە سەر ئەفغانستان، لەماوەی چەند مانگێکدا لرز کردو قووتی دا، زۆر بەتوندی لەو موسلمانانە درا، کە بەرهەلستی پەلامارەکانی کۆمەنیستی یان دەکرد،تەنانەت بۆمبی ناپالم وگازی خنکێنەری قەدەغەکراوی نێودەولەتی

[1] دیارە ئەم زانیارییانە باسی سالی١٩٧٩دەکەن، کاتێك ڕوسیا بەدەستتێوەردانی سەربازی حکومەتێکی کۆمەنیستی لە ئەفغانستان دامەزراند.
[2] الشیوعیة خلاصة کل ضروب الکفر،احمد عبدالغفور، ص٨

تێدا بەکارهێنرا، هیچ گوێ نەدرا بە نرخ وبەها مرۆڤایەتییەکان، جیهانیش لێی بێدەنگ بوو، هیچ نارەزایەتییەك دەرنەبردرا .

پێویستە لەسەر جیهانی ئیسلامی ئاگاداری ڕاستییەکی زۆرگرنگ بێت، ئەویش ئەوەیە ڕوسیا ئەفغانستانی داگیرکرد، بۆ ئەوەی ببێتە پێشەکییەك، بۆئەوەی دەستی بگات، بە دەریا گەرمەکان و کەنداوی عەرەبی ودیجلەو فورات.

خۆیان ئامادەکرد بۆدروستکردنی نیزام وحوکم وفەرمانڕەوایی کۆمەنیستی لە هەندێك لە وڵاتانی دوورگەی عەرەبی و هەندێك وڵاتی ئەفریقیای نزیك لە دوورگەی عەرەبی ئەمانە هەمووی ئەوە بەسەر جیهانی ئیسلامی دەسەپێنن، لەنێوانیشیاندا عەرەب، کەیەکبگرن لەئامادەباشیدابن و واز لەناکۆکی نێوان خۆیان بهێنن، بۆ ئەوەی نەبنە نێچیری کۆمۆنیزم.

هەرچی موسڵمانەکانی خودی ڕوسیان، جیاوازی هەیە لەسەر ژمارەیان، کە لەنێوان شەست تا سەد ملیلۆن کەسدایە، هەروەك چۆن جیاوازی لەسەرژمارەی مزگەوتەکان هەیە لەوێدا، هەندێك دەڵێن ژمارەی مزگەوتەکان دەگاتە بیست وپێنج هەزار مزگەوت .

لەڕاستیدا، لەچارەگی کۆتایی ئەم سەدەیەدا ئیسلام بەئاگاهاتەوە، بەئاگاهاتنەوەکەشی هەڕەشەیەك بوو، بۆ سەر ئەو ڕێباز و ڕێچکانەی (وێرانکەربوون)و شێوازو ڕێگەی جۆرا وجۆریان گرتۆتە بەر بۆ شەڕکردن لەدژی ئیسلام.

کۆمەنیست وجوولەکە و نەسارا بانگەشەی ئەوە دەکەن، کەئیسلامێکی نوێیان هێناوە، ناویان ناوە(خاوێنکردنەوە)ی ئیسلام، بەمەش ویستیان ئیسلام بەتاڵ بکەنەوە لەناوەڕۆکە ڕاست وڕەسەنەکەی.

لەڕاستیدا خەریکبوونی ئەو ولاتە عەرەبی وئیسلامییانە بەکێشەوگرفتی خۆیان، وایکردووە ئاگایان لە کێشەوگرفتەکانی ولاتەکانی تر نەمێنێ، هەوڵنادەن یارمەتی وکۆمەکی دەست و برد و چالاکانە پێشکەش بەیەکتری بکەن، چونکە ڕۆژهەلات وڕۆژئاوا، پێشبڕکێ دەکەن لەسەر لێدانی عەرب وموسڵمانان.

بنچینەو بناغەی بیری کۆمەنیستی شتێکی ناوێزە(شاذ)و نامۆیە(غریب)ە، لەئەنجامی کارتێکردنی چەند ڕەگەزو هۆکاری جیاواز دەرکەوت و پەیدابوو. ئەم هۆکارانە بۆ دروست بوونی کۆمەنیستی لە ئەوروپای ڕۆژئاوا لە سەدەی نۆزدەیەمی زایینی دا کۆبوونەوە.

لەڕێکەوتە سەیرو سەمەرەکانی کۆبوونەوەی عەقڵییەتی جوولەکە، کە لە کەسایەتی (کارل مارکس) خۆی دەبینێتەوە، لەگەڵ دەمارگیری ئینگلیزەکان بۆئازادی تاکە کەسی وئازادی بیری، لەگەڵ شۆڕشەگەورەکانی فەڕەنسا، لەگەڵ فەلسەفەی ئەڵمانی، ئەمانە هەموویان بەیەکەوە کۆبوونەوە بۆدروستکردنی نیزام وپێڕەوی کۆمەنیزم.

هیچ گومانمان نییە بیری جوولەکە و یەهودیەتی ڕق ئەستور بەرامبەر بەمرۆڤایەتی، بنەماو بنچینەی کۆمەنیستی پێکدەهێنێ، کە لەڕووی

بنچینە و مەرام و مەبەستەوە، لەگەڵ یەکتر دەگونجێن.(١)

هەر بەم بۆنەیەوە، کاتێك قسە لەسەر کۆمۆنیزم دەکەین، ئەوەمان بەبیر دێتەوە، کەئیسلام تاکە ئایینە لەنێوان ئایینە ئاسمانی و سەرزەمینییەکان و ڕیبازە کۆمەڵایەتییەکاندا، کەهەندێك سیما و شەقڵ هەیە لەئایینەکانی تردانییە، بەڵام لەئیسلامدا هەیە، ئایینی ئیسلام ئایینی مرۆڤایەتی وخوڕەوشت و پاککردنەوەی دەروون و پاکڕاگرتنی ماددی ومەعنەوی هەموو ئەندامەکانی لەش و هەموو هەستەکانە، ئایینی عەدالەت و ڕاستی و چاکە و بەخشندەیی و ئەرکەکانە، ئەو ئایینەیە، کە یەکسانی دەکات لەنێوان فەرمانڕەواو و فەرمان بەسەرداکراودا، هەژار و دەوڵەمەنددا، لەهەموو ماف و ئەرکەکاندا، یەکسانی دەکات لەنێوان هەمووانا، لەئەنجامدانی فەرز و واجب و پەرستشەکاندا(العبادات).

هیچ کەسێك لەکەسێکی تر جیاناکاتەوە، تەنیا بەگوێرەو ئەندازەی ئەو خێروچاکەیەی دەیکات، بۆ خۆی وکۆمەڵگاکەیی و مرۆڤایەتی، ئەوەش بزانە واقیعی موسڵمانان لەم عەسروسەردەمەدا، بەڵگەنییە، لەسەر ئیسلام، چونکە ئیسلام لە هیچ وڵاتێك حوکمی پێناکرێت، تەنیا لە مەملەکەتی سعودی عەرەبی نەبێت.(٢)

حوکمکردن بەئیسلام بەڵگەیە لەسەرئەوەی، کە ئیسلام بۆ هەموو سەردەم و هەموو شوێنێك دەگونجێت.

---

[١] الشیوعیة خلاصة کل ضروب الکفر،ص ٢٩-٣١

[٢] لە وڵاتی سعودیەشدا، لەڕاستیدا کار بەو ئیسلامە پاك وبێگەردە ناکرێت، کەلە سەردەمی پێغەمبەر(د.خ) وخولەفای ڕاشیدیندا کاری پێکراوە.(وەرگێڕ)

ئیسلام دەتوانێت وا لەخەڵك بکات، ڕووبەڕووی باروودۆخە جیاوازەکان ببنەوە، ئەگەرچی باروودۆخ وجۆری ژیانەکەشیان زۆر پێشکەوتووبێت، دەتوانێت بەشێوەیەك لەگەڵ باروودۆخەکەیان بگونجێنێت، کە شایەن و گونجاو بێت، بێ ئەوەی تووشی سستی و وەستان وپەککەوتن بێت، چونکە گیان ویاسا و دەستووری پێڕەو بوونی ئیسلام، لەگەڵ بەرەو پێشچوونی ژیان دەڕوات.

هەرچی بیری کۆمۆنیزمییە، پوختەکەی ئەمەیە، خەڵك وکۆمەڵگا بریتی نییە لەتاکەکەس و، بەڵکو بریتییە لە چین، واتە بنچینە وبنەڕەت بۆ بوونی تاکە کەسەکان نییە، دان بەکەسایەتی خۆرسك وسروشتی تاکە کەسەکان نانێت، بەڵکو دان بەبوونی سروشت وخۆرسکی چین(طبقة) دادەنێت لەناو کۆمەڵگادا.

لەوکاتەدا شەڕوململانێ لە نێوان چینی زەحمەتکێش و مافخوراو و چینی مافخۆر، دەست پێدەکات، ئەم شەڕو ململانێیەش نابەرابەرییە و هاوتا نییە، چونکە چینە زەحمەتکێشەکان هۆشیاریان کەمە وچینە سەردەست و مافخۆرەکانیش بالآدەستن و فەرمانڕەوان وخاوەن دەسەلأتن، جارێك هەڵدەستن بەبەنج کردن وبێ ئاگاکردنی چینە زەحمەتکێش و هەژارەکان بەهۆی ئایین و نازونیعمەتەکانی بەهەشت وڕۆژی دوایی، جارێکی تریش بەهۆی نیشتیمانپەروەری و شکۆمەندی نەتەوایەتی، هەموو ئەمانە تلیاکی(ا فیون)ی جەماوەری هەژارو زەحمەتکێشن، بۆئەوەی بنوون و بەخەبەر نەیەن لەواقیعی بەئێش و ژانی خۆیان، ڕازی بن بەوناز و نیعمەتەی چاوەڕێی دەکەن.

لێرەدا هیچ جێگەوشوێنێك بۆ دادپەروەری نامێنێتەوە، دادپەروەری ماناکەی بوونی نامینێ، چونکە ململانێی چینایەتی جەنگی لەناوبردن و لەناوچوونە، ئەوەك بەربەرەکانێ و پێشبڕکێیەکی وەرزشیانە بێت، کەتیایدا ڕکابەرەکان پێویستە، یاساو بەرنامەی یارییەکە بزانن و بەم شێوەیە وەرزش لەسەر دادپەروەری بنیاد دەنرێت.

بەلاّم ئیسلام تێڕوانینی کۆمۆنیزم بۆ حکومەت بەهەموو شێوەیەك ڕەتدەکاتەوە، چونکە کۆمۆنیزم،ڕێبازێکە بەتاڵەو خالی کراوەتەوە، لەهەموو یاساکانی ویژدان ورەوشت، لەبەرئەوەی کۆمۆنیزم ڕێبازێکە بۆ تێکدان ورووخاندنی ئاین و هەموو نرخ و بەهایەکی مرۆڤایەتی، لەو ڕۆژەوەی کۆمۆنیزم دروست بووە وبەرپابووە، جیهان دەبینێت ودەبیستێت، کە چۆن ملیۆنەها کەس بوونەتە قوربانی وهەزارەها کەس لە ڕوسیا نەفی کران بۆ سیبیر یا، بزوتنەوەی کۆمۆنیزمی لەهەر وڵاتێك ڕوویدابێت، لەسەر ڕوباری خوێن وتوندوتیژی وزۆرداری دامەزراوە، چونکە ئەمە شەقڵ ومۆرك وسروشتی کۆمۆنیزمە.

پوختەی قسە : کۆمۆنیزم پێچەوانەی مرۆڤایەتییە وگەورەترین وسەرسەختترین دوژمنی ئیسلامە، ڕێبازێکە مرۆڤایەتی تێدانییە، چۆن شەڕ هیچ خێروچاکەیەکی تێدانییە، بەهەمان شێوە کۆمۆنیزمیش بەهیچ شێوەیەك مرۆڤایەتی تێدا نییە.[1]

---

[1] الشيوعية خلاصة كل ضروب الكفر،احمد عطار،ص٦٢-٦٧-٧٠

# کۆتایی

١-هەڵوێستی موسڵمانان بەرامبەر بەگاورکردن.

٢-ئەرکی موسڵمانان بەرامبەر بە گاورکردن.

## یەکەم : هەڵوێستی موسڵمانان بەرامبەر بەگاورکردن.

هـــەرکاتێك نـــا کاتێـــك لەزۆربـــەی وڵاتـــە ئیســـلامییەکاندا، رابـــوون وچاکسـازییەك بـەرپادەبێت ودروسـت دەبێـت، بانگـەوازکردن بـۆ ئیسـلام وکارکردن بۆبڵاوکردنەوەی زانسـتە ئیسـلامییەکان بنیاددەنێت.کاردەکـات بۆدیارخستن و زیندووکردنەوەی پەیوەندی نێوان زانستە ئایینی و زانسـتە دونیـایی یـەکان، بەدیارخسـتنی نـرخ وبـەهای رۆشـنبیری ئیسـلامی و ڕوونکردنـــەوەی ئـــەو درۆ دەلەســـانەی لەلایـــەن هەرســـێ باڵەکـــەی بەگاورکردن، (موژدەدان و رۆژهەلاتناسی و داگیرکردن)هەڵبەستراون، بۆپاککردنـــەوەی سەرچـــاوەوبنەماو بنچـــینەی ئـــایین، لـــەو لێڵـــی وشێواندنەی، لەلایەن بانگەشەکەرانی بەگاورکردن بۆی دروستکراوە.

ئەو ڕابوونانە هەوڵ وتێکۆشانێکی زۆردەکەن بـۆ بنیادنـانی دامودەزگـا بچـووکەکانی خۆیـان، بـە هـەوڵ وتێکۆشـان ونارەقـەی خۆیـان، بـەلام بەداخەوە بێ ئەوەی یارمەتی وپشتگیرییەکی ئـەوتۆی لێبکرێـت، لەلایـەن دەولەمەند و دەسەلاتدارەکان.

ئـەم ڕابـوون ودامودەزگایانـە، تـازە دەیانـەوێت لەسـەر پێـی خۆیـان بوەسـتن وچـالاکی دەکـەن بۆبـەدیهێنان و جێبـەجێکردنی هەنـدێك لەئامانجەکانی. کەچی چاوی دوژمنەکانی ئیسلام دەکرێتەوە، لەنەسرانی و هاوکارەکـانی، ئەمانـە زۆر بـەوردی چـاودێری ئـەم ڕابوونـە ئیسـلامییە دەکـەن، چـاودێری هـەنگاوەکانیان دەکـەن . پاشـان کاردەکـەن

لەسەرشکست پێهێنانی کارو پرۆژە چاکەکانی ئەم ڕابوونە. بەهۆی بەکارهێنانی ئامرازو هۆکارو شێوازی جۆرا وجۆری باوەڕپێکەر، لەناوخۆو لەدەرەوەدا. چەند دەستەوتاقمێکی تریش لەڕیزی موسڵماناندا هاندەدات بۆدژایەتی کردنی ئەم ڕابوون و دامودەزگا چاکسازییانە، هەروەك چۆن، لە ناو دەوڵەتدا چەند دەزگایەکی دەسەڵاتدار بەسەریانەوە دەکەنە چاودێر.

دژایەتی کردنەکەش بەم شێوەیە دەبێت :

١-داخستن وڕێگەگرتن لەهاتنی کەل وپەل بۆیان، هەتا دووچاری هەژارییەکی ڕیسواکەربینەوە، جا یان خۆی تووشی فەوتان و وێرانبوون و ڕوکانەوە دەبێت،

یان ئامانجە بنەڕەتی وسەرکییەکەی بەرەو تێکچوون و خراپ بوون دەڕوات.

٢-چاندن وتێئاخنینی دوژمنانی ئیسلام وڕەگەزی خەراپ لەناو ئەم دامودەزگایانە و فریودان و هەڵخەڵەتاندنی ئەو کەسانەی کار لەم دامودەزگایانە دەکەن، بەهەموو جۆرەکانی فریودان.

٣-یان داخستنی دەرگای کاروبژێوی ژیان لەڕووی ئەوکەسانەی لەم دامودەزگایانە کاردەکەن.

٤- یان دروستکردنی جۆرەها تۆمەت وناوزڕاندن دژی ئەوکەسانەی لەم دامودەزگا و ڕابوونەدا کاردەکەن، بۆ ئەوەی نەبنە جێگەی متمانەی خەڵك.

لەکۆتایشدا، بەئاشکراو بێ بەهانەو بێ ئابڕووانە، بۆڕووخاندنی ئەم ڕابوونە کاردەکەن، بۆئەم مەبەستەش هەموو دامودەزگاکانی داگیرکەران هاوکاری یەکتردەکەن، ئەگەرچی لەسەر بەرژەوەندی خۆیان ناکۆکیان هەبووبێ، یان لەڕووی بنچینەوبنەما وبیروباوەڕەوە جیاوازیان هەبووبێ. بەم شێوەیەکاردەکەن، هەرکاتێك بزوتنەوەیەکی ئیسلامی، یان ڕابوونێکی ئیسلامی چالاك ببێت، هوشیار ببێت، لەیەکێك لە وڵاتە ئیسلامییەکاندا، ئەوا لە بۆسە و کەمیندان چاودێری هەموو چالاکییەکی گەورەوبچووکی ئیسلامییەکان دەکەن.

لەکاتێکدا دامودەزگاکانی موژدەدان یارمەتی وهاوکاری زۆرگەوریان پێدەگات، لە وڵاتە داگیرکارییە جیاوازەکانەوە، دەبینین توێژەرونووسەرە موسـڵمانەکان،قەڵەمەکانیان ڕادەگیرێـت، زۆر کۆسـپ وتەگـەرەو بەربەربەستیان دەخرێتە پێش، یان پەیداکردنی بژێوی ژیان ناچاریان دەکات، زۆربەی کاتەکانیان بۆکارکردن تەرخان بکەن، ئەمەش وا دەکات، کە لەبیرکردنەوەی ئازادو داهێنانی بەرهەمی بەرز دابڕێن.

ئەگەر دامودەزگا ئیسلامییەکان، یەك لەهەزاری ئەو کۆمەك و یارمەتی و هاوکارییانەیان پێ بگات، کەبەدەست دامودەزگاکانی موژدەدەرەکان دەگات، ئەوا دەیانتوانی خزمەتێکی گەورەو بەرچاوی کێشەو مەسەلە ئیسلامییە جیاوازەکان بکەن.

تاقیکردنەوە و ئەزموون سەلماندوویەتی، کە هەندێك بانگخوازی ئیسلامی سادە، ئەوانەی، کەبەپاڵنەرێکی خودی لەدڵ ودەروونی خۆیانەوە کاردەکەن، بەرامبەر بەدەیان موژدەدەری ئامادەکراو بە

زانستی بەرز دەوەستن، ئەمەش لەبەرئەوەیە زانا موسڵمانەکان تەقواو پارێزکاری خوای گەورەو مەزن دەکەن، خۆیان بەخوا دەپارێزن، بۆیە دوژمنەکانیان نەیانتوانیوە، کەلتوورە ئیسلامییەکە لەناوببەن،

چونکە خوای گەورە کتێبەکەی خۆی پاراستووە، ئەوەی لەسەرموسڵمانان پێویستە نەخشە دابنێن و هەموونامرازو هۆکارێک بەکاربهێنن بۆپاراستنی کەلتوور و کەلەپوور و رۆشنبیری گەورەی ئیسلام، بەلاّم راستییەکیش هەیە، ناتوانرێت نکووڵی لێبکرێت، زۆربەی پێشەنگ و رابەرەکانی ئەم نەوە نوێیە کاریگەربوون بەهێرش و هەڵمەتەکانی غەزو و داگیرکاری بیری و دەروونی و کۆمەلاّیەتی و رامیاری و رەوشتی، ئەو غەزو وداگیرکارییەی دوژمنانی ئیسلام ئێمەیان پێ غەزوکردووە، بەهەموو شێوەوشێوازەکانی، بۆیە کاری ئیسلامی راست و رەوا داوا لە پێشەنگ و رابەرە هۆشیارە ئیسلامییەکان دەکات، لەبزوتنەوەوجولانەوەیەکی چالاکدا بن، کە رازاوە بێت بە پشوو درێژی وسینگ فراوانی، پەلەنەکردن لەگەیشتن بەئەنجام و نەخشەدانان بۆ کاتێکی دوور و درێژخایەن، دەبێت خاڵێکی گرنگیشمان لەیاد نەچێت، ئەویش ساردکردنەوەی دووبەرەکی وجیاوازی مەزهەبی وکارکردن لەسەر لەیەکترنزیکردنەوەی بیروبۆچوونەکان، بەرێگەیەك، کە مشتومڕودەمەقاڵێ و رق وکینەی تێدانەبێت، لەرێگەی نووسینی کتێبی دەوڵەمەند بە میانڕەوی ونەرم ونیانی وخستنە رووی هەق و راستی بەبەڵگەوە، بەبێ

زەقکردنەوەی و ێنەو دیمەنی دەمارگرژی، لەگەڵ ڕیسواکردنی پیلانـەکانی دوژمنانی ئیسلام.(۱)

## دووەم : ئەرکی موسڵمانان بەرامبەر بەگاورکردن.

لەم پێشەکی وخستنەڕووەی پێشوودا، ئەوەمان بۆڕوون دەبێتەوە، کە موژدەدەر و ڕۆژهەڵاتناسەکان پێی هەڵساون وپێی هەڵدەستن، بریتیە : لە سـازدان و ڕێکخسـتنی پیلانگێـری دژی ئیسـلام وموسـڵمانان وشـێواندنی وێنــەی ڕۆشــن وڕوونــاکی ئــایینی پــاك وبێگــەردی ئیسـلام وپــەیامی موحەممەد(صـلی الله علیـە وسـلم)، ئەمـەش بەبڵاوکردنـەوەی گـومڕایی و لەخشتەبردن وبەلاڕێدا بردن، بۆ ئەوەی موسـڵمانان متمانـە بـەخۆبوونیان لەدەسـت بـدەن و وا بـیر بکەنـەوە، کـە ئیسـلام هـۆی دواکـەوتن ونـزم ونزمبوونــەوەی موســڵمانانە، مــوژدەدەرو داگیرکەر(اســتعمار) و شــوێن پەنجەی بەگاورکردن و ڕێنمایی یەکانی ئەوان، تاکە ڕێگـەی هەڵسـانەوە و ژیانەوە و بەرزبوونەوەی موسڵمانانە.

بـەڵام هـەر زوو پیـاوانی دڵسـۆزی ئیسـلام بـە ئاگاهاتنەوەوخـەڵکیان ئاگادارکردۆتـەوەو ڕێیـان نیشـاندلون، لـەو کەنـدەڵان وهەڵدێرە هـەزار بـە هەزارەی، کەنزیك بـوو، موسـڵمانان تێـی بکـەون، وا خەریکـە موسـڵمانان هەست دەکەن و ئازار دەچێژن، پاشان ڕوویانکردەوە ڕابردووی پڕ شکۆ و پرســەروەریان، بەگەڕانــەوە بۆ(کتێبــە ڕێ نیشــاندەرەکەیان)(قورئانی

---

[1] أجنحة المكر الثلاثة، ص٦١١-٦١٢

پــیرۆز)، لەهــەموو ولاتێــك بەئاگاهاتنەوەیــەك و لەهــەموو نەتەوەیــەکی ئیسلامی ڕابوونێك بەرپابوو، بەڵام ئایا ئەوەندە بەسە، بەبەڵگەی ئـەوەی ئیسلام هێزێکی خودی نـاوخۆیی هەیـە، کەئەسـتەمە دوژمنـەکانی بتـوانن کاریگەری تێ بکەن، لەبەر بێگەردی ناوەڕۆکەکەی و پیرۆزی ڕێنماییەکەی و بەهێزی بەڵگەکەی و دروستی و گونجاوی ژیربێژیی(منطق)ەکـەی، وەڵام : نەخێر ئەوەندە بەس نییە.

ئەرکی موسڵمانان ئەوە لەخۆ دەگرێ، هەڵسن بەبڵاوکردنەوەی ئیسلام وبانگەواز بۆکردنی، چونکە پەیامی ئیسـلام ئاڕاسـتەی هـەموو مرۆڤایـەتی کراوە بەگشتی، لەگەڵ ئەوەشدا دەوڵەمەندە بەبەڵگەو بورهـان، بـەڵام بـە بەردەوامی پێویستی بەوە هەیە، کۆمەڵە کەسێك هەڵسـن بەخسـتنەڕووی ئیسلام بە شـێوازێك، کـەبگونجێت لەگـەڵ هـەموو ژینگـەو دەوروبەرێکـدا، هەموو هۆکاروئامرازێك بگرنە بەر، کە بۆهەموو سەردەمەکان دابینکراوە.

قورئـانی پـیرۆز داوای لـە پێغەمبـەری بەڕێز(سـەلات وسـەلامی خـوای لەسەر بێت)کردووە، هەرچی لەتوانایدایە بیبەخشێت وبەکاری بهێنێـت بـۆ بڵاوکردنەوەی بانگەوازی ئیسـلام لـەنێوان نەتەوەکانـدا، موسـڵمانانیش، کـە شـوێنکەوتووی پێغەمبـەری خودان(صـلی الله علیـه وسـلم)، فـەرمان پێکراون بە هەڵگرتنی مەشخەڵی ئیسلام و گەیانـدنی پـەیامی ئیسـلام. لـە ئێستادا دەتوانین ئەرکی موسڵمانان لەڕووبەڕوونەوەی لەگەڵ نەسـرانییەت و بڵاوکردنەوەی بانگەوازی ئیسلامی لەم خاڵانەدا کورت بکەینەوە.

١-دەسـتگرتنی موسـڵمانان بـە ڕێنمـایی و ڕەوشـتەکانی ئیسـلام، بـۆ ئەوەی ببنە نموونەی بـالا وتـەولو وپیشـەنگێکی چـاك بۆڕاکێشـانی خـەڵك

بۆناوئیسلام، ئەم کارە گرنگەش لە ئەستۆی زانایانی موسلمانان وئامۆژگاریکەرو وتاربێژی مزگەوتەکان و کاربەدەستان ودەسەلاتداران ودایك وباوکانە، کارکردن لەسەر بەستنەوەی مالی موسلمان بە مزگەوتەوە.

٢-پێشخستنی بەرنامەو پرۆگرامەکانی پەروەردە و فێرکردن، لەهەموو قۆناغەکانی خوێندن وفێرکردن، بەشێوەیەك بگونجێت لەگەل سروشتی زانستە ئیسلامییەکان وتێکەیشتن لێی، لەگەل گرنگیدان بە لێکۆلینەوە لەقورئانی پیرۆزولەبەرکردنی، بۆ ئەوەی نەوەیەك پێ بگات لەئیسلام تێ بگات وکاریگەربێت، بەڕێنمایی یەکانی ئیسلام.

٣-کارکردن لەسەر لابردن ونەهێشتنی ئەوهۆکارانەی دەبنە مایەی جیاوازی وپەرتەوازەیی موسلمانان و وادەکات، ببنە کۆمەلێك پارت وگروپ ومەزهەبی رامیاری وکۆمەلایەتی جیاواز، ئەمەش بەگەڕانەوە بۆکرۆك وناوەڕۆکی ئیسلام وکۆلەکەکەی، کەقورئانی پیرۆزو سوننەتی پاکی پێغەمبەر وکاروکردەوەکانی خولەفای ڕاشیدین وڕێنمایی کراوانی دوای پێغەمبەری خودا(صلى الله عليه وسلم).

٤-لەسەرحکومەتە ئیسلامییەکان پێویستە، بەرەوشەریعەتی ئیسلامی بچن، چونکە هۆکاروئامرازەکانی هەلسانەوە و بووژانەوە و ڕابوون و بەرزبوونەوەی تێدایە، پێویستە یاساو یاسادانان پاك بکرێتەوە، لەوەی پێیەوە لکاوە، لەیاسا و مادەی بێگانە، کەجیاوازە لەژینگەی موسلمانان و لەگەل شەقل و مۆرك و سروشتی ژیانی خەلکەکە ناگونجێت، ئەگەر

ئەمـە جێبـەجێ بـوو ،ئـەوا کۆمـەڵگا لەماوەیـەکی کورتـدا، دەگۆڕێـت بۆکۆمەڵگایەکی ئیسلامی ڕاست و دروست،لەپێڕەو و خورەوشتدا.

٥- کـارکردن لـە سـەر پێشخسـتن و پەرەپێـدانی کتێبـی ئـایینی ودانـراوە(المؤلفـات) ئیسـلامییەکان، هـەتا ئیسـلام بەوێنـە جـوان وسادەوساکارەکەی بەدیاربکەوێت،چونکە ئیسلام ئاینێکە عەقڵ دەدوێنێ و بانگەشە بۆ ئـەوە ناکات، کـە بـەبێ ئـەزموون، بـەدوای شارسـتانییەتە جیاوازەکان بکـەوین، بـەڵکو بانگەشـە دەکات بـۆ خوێندنـەوە و زانسـت، یەکـەم سـوڕەت لـەقورئانی پـیرۆز دابەزی،سـوڕەتی (علق)بـوو، کەباسـی خوێندنەوە دەکات.هەروەك دەفەرمووێت﴿اقرا باسم ربك الذی خلق*خلـق الانسان مـن علـق*اقرا وربـك الاكرم*الـذی علـم بـالقلم*علم الانسـان مـا لم یعلم﴾(سوڕەتی (علق)ئایەتی ١- ٥)

واتە((ئـەی موحەممەد(صـلی الله علیـە وسـلم)بخوێنە بـەناوی ئـەو پەروەردگارەتـەوە، کـە هـەموو شـتێکی دروسـتکردووە، ئـادەمیزادی لەپارچـە خـوێنێکی هەڵواسـراو لەناومنداڵدانـدا دروسـتکردووە* بخوێنـە وخوای تۆ لەهەموو بەخشندەیەك بەخشندەترە یا بەخشـندەی تاقانەیـە* ئەو خودایەیە، کە ئادەمیزادی بەهۆی قەڵەمەوە فێری خوێنـدن کـردووە، فێری ئەوشتانەی کردووە، کەپێشتر نەیزانیوە))

٦- ڕۆشبیرکردنی بانگخوازی موسڵمانی کەم توانا، ڕەوانـەکردنیان بـۆ ولاتەبێگانەکان و پێشخستن و پەرەپێـدانی تواناکانیـان، بۆئـەوەی بگەنـە ئاستێك، کە گونجاو و شیاو بێـت، لەگـەڵ ئیسـلامدا، بـۆ ئـەوەی شـارەزا وکارامە بن لەسەر چۆنیەتی بڵاوکردنـەوەی بانگـەوازی ئیسـلامی و زمـانی

عەرەبی لەفراوانترین سنوورو هەرێم،چونکە بەداخەوە، زۆربەی بانگخوازەکان تەنیا نێردراون و ڕەوانەکراون بۆفێربوونی زمێریاری و هونەری خۆشنووسی و ڕێزمان و ڕێنووسی عەرەبی.

٧- دروستکردن و دامەزراندنی ڕێکخراوی ئیسلامی جۆر بەجۆر، کەخزمەتی ئیسلام بکات، بەشێوەیەك ئەرکی ئەم ڕێکخراوانە لەم دوو خاڵەدا چڕبکرێتەوە.

ا- ئاشکراکردن وخستنەڕووی شێوازەکانی موژدەدان و بەگاورکردن و پیلانەکانی موژدەدەرەکان و ڕۆژهەلاتناسان و بەرپەرچدانەوەی یەك بەیەکی درۆ ودەلەسە وبوختانەکانیان و لەڕێ لادان و گومڕاکردنەکانیان، دژی ئیسلام وموسڵمانان، بلاوکردنەوەی ئەو بەرپەرچدانەوانە لە هەموو جیهاندا.

ب -هەڵسان بەبانگەوازکردن بۆ ئیسلام لەهەموو جیهاندا و ئەمەش پێویستە کەسایەتی بیرمەندو هوشیاری بۆ ئامادەبکرێت وتوانایەکی فرلوانی دارایی و هۆکارەکانی ڕاگەیاندن و دوزگاکانی بلاوکردنەوەیان و بخرێتە ژێردەست، پێویستە حکومەتە ئیسلامییەکان یارمەتی چالاکانە بەڕێکخراوە بانگخوازە ئیسلامییەکان بکەن، جا لەناوەوە یان دەرەوەی وڵات بێت، هەروەها دروستکردنی دامودەزگاو ڕێکخراوی ئافرەتان بۆ بانگەوازی ئیسلامی، کە دەرچووانی کۆلێژو زانکۆی خوێندنە ئیسلامییەکان لەخۆ بگرێت، بۆ ئەوەی ببنە دەروازەیەك بۆ ماڵی موسڵمانان وگێڕانەوەی ئافرەتی موسڵمان بۆ ڕێنماییەکانی ئاینەکەیان،

بەمەش ئافرەتە موژدەدەر و مەسیحیەکان ناتوانن کاریگەری لەسەر عەقیدە وبیروباوەڕیان دروست بکەن.

٨- لەسەر دەوڵەت وحکومەتە ئیسلامییەکان پێویستەچاوێك بەناوەندە پزیشکی وپەرستیاری و نەخۆشخانەکان و بنکە تەندروستییەکان وهەموو قوتابخانە و ناوەندەکانی فێرکردن و زانکۆکان و یانە کۆمەڵایەتی و وەرزشییەکان و هەروەها خانەی میوانداری ودەزگاکانی چاپ وبلاوکردنەوە، بخشێنێتەوە، ئەوەی، کە موژدەدەرەکان دایانمەزراندووە.

٩- ڕێکخستنی بانگەوازی ئیسلامی، زیندووکردنەوەوئامادەکردنی (دوو)گۆڕەپان، کە خاکەکەی زۆر بەپیت و بەرەکەتە بۆ بلاوکردنەوە و گەشەسەندنی ئیسلام، لە هەر شوێنێك بێت لەسەر ڕووی زەوی، گۆرەپانەکانیش ئەمانەن :

ا – بلاوکردنەوەی بانگەوازی ئیسلامی لەنێوان بت پەرست وئەوانەی هیچ ئایینێکیان نییە، تەنیا دەستیان بە داب ونەریتەوە گرتووە، ئەم خەڵکانەش لەکیشوەرەکانی(ئاسیا وئەفریقیاو ئوسترالیا)بلاوبوونەتەوە، دەتوانرێت لێکۆلینەوە لەشێوازی ژیانی ئەو خەڵکانە بکرێت، بۆئەوەی شێوازێکی گونجاو بگرینە بەر بۆڕێنوێنی کردنیان بۆ ڕووناکی ئیسلام و هاتنە ناوپەرژین و چوارچێوەی باوەڕوئیمان، بەدانایی ولێزانی و ئامۆژگاری چاك وهەڵس وکەوت وڕەوشتی باش و مامەلەی نەرم ونیان، لەلایەن بانگخوازە موسڵمانەکان، ئەمە جگە لەدڵسۆزی بۆ بلاوکردنەوەی بانگەوازی ئیسلامی بەهاوکاری لەگەڵ بازرگان وفەرمانبەری بەغیرەتی

موسلّمانان، ئەوانەی بلاّوبوونەتەوە لەهەموو شوێنێك، ئەم کارەش بەویستی خوای گەورە، لەماوەیەکی کورتدا، باشترین بەرهەم وئەنجامی دەبێت، بەهاتنە ناوەوەی ئەو بت پەرست وئەوانەی هیچ ئایینێکیان نییە، بۆناوپەرژین وچوارچێوەی باوەڕوئیمان و باوەشکردنیان بە ئایینی ئیسلامدا، چونکە ئەگەر بەدوای هۆکارەکانی بلاّوبوونەوەی ئیسلام بگەڕێن، دەبینین چۆنیەتی بلاّوبوونەوەی ئیسلام لەم ناوچانەدا دەگەڕێتەوە بۆ ئەو بازرگانە موسلّمانانەی، کە لەم ناوچانەدا دەگەڕان، کە بت پەرستە سەرەتایی یەکانی تێدا نیشتەجێبوون، چونکە موسلّمان بەسروشت و ڕەوشتە ڕاست ودروستەکەی کەسێکی موژدەدەرە.

ب – خستنەڕوو پێشکەشکردنی ئیسلام وبانگەواز بۆکردنی لەناو گەل ونەتەوە مەسیحیەکاندا، لەئەورپا و ئەمریکادا، چونکە پێشکەوتنی زانست و زانیاری وبلاّوبوونەوەی زانیارییەکان لە وێدا، وا پێویست دەکات، کە ئەوە بەدیار بخرێت ونیشان بدرێت، کە ئیسلامی پیّ دەناسرێتەوە، ئەویش بریتییە لە بەرزی یاساو پێڕەوو، بەرزی ڕێنمایی یەکان وبەرزی شەریعەتەکەی. ئەگەر زانا گەورەکانی ئیسلام، ئیسلام ئاراستەی نەسرانییەکان بکەن، ئەوا نەسرانییەکان دەبینن، کە ئەم ئایینە(ئیسلام) شان بەشانی شارستانییەتەکەیان وهێزە مادیەکەیان دەڕوات، دژوپێچەوانە نییە، نە لەگەلّ ئەوزانست و زانیارییانەی بەدەستیان هێناوە، نە لەگەلّ ئەو شەریعەت و یاسایانەی لەسەری دەڕۆن و پەیڕەوی دەکەن، بەلّکو کاتێك باوەش بەئیسلامدا دەکەن و دێنە ناو ئیسلامەوە، سەیردەکەن چارەسەرێکی شیفابەخشە بۆ ئەودەرد و نەخۆشییە

کۆمەڵایەتی و دەروونیانەی هەستی پێدەکەن، چونکە ئیسلام بەهۆی ئەو یاساو ئەحکام وپەیڕەوەی هەیەتی، بەشێوەیەك دەوەستێ، کەبوار دەبەخشێتە پێڕەو و سیستەمە کۆمەڵایەتییە دژبەیەکەکان، کەلەناو بانگەوازی ئیسلامیدا دەروازەیەکی ڕزگاربوون بدۆزنەوەو ببێتە فریاد ڕەس بۆیان، لەم ژیانە ماددیگەرایی یەی، لەڕۆژگاری ئەمڕۆدا، دەستی بەسەرهەردوو زلهێزەکەدا گرتووە،، ماددیگەرایی کۆمۆنیزمی وماددیگەرایی سەرمایەداری.

١٠- دەبێت بانگەوازی ئیسلامی بەهێزوقایم بکەین، ئەمەش بەدروستکردن ودامەزراندنی دەستەی زانستی ئیسلامی لەهەموو وڵاتێکی ئیسلامی، بەڕێکخستن و هەم ئاهەنگی لەنێوان خۆیاندا، ئەرکەکانی ئەم دەستەیەش ئەم خاڵانەی خوارەوە دەبێت :

أ - ئاماروسەرژمێرییەکی ئەو هەڵە وگومڕاکردن ولەخشتەبردن و درۆ ودەلەسانە بکەن، کەڕۆژهەڵاتناسان کردوویانە، لەکتێبێکی گەورەدا، لەگەڵ ڕەددانەوەو بەرپەرچدانەوەی ئەو درۆودەلەسانە،بەبەڵگەی باوەڕپێکراو بڵاوکردنەوەی لە هەمان کتێبدا.

ب- چاودێریکردن وبەدواداچوونی ئەو کتێبانەی مـوژدەدەر و ڕۆژهەڵاتناسەکان دەری دەکەن و بەرپەرچیشیان بدەنەوە.

ج - دۆزینەوەی چارەسەرێکی زانستییانە بۆکێشەوگرفتی ئەو شاندونوێنەرو نێردراوە زانستییانەی، کەزانکۆ عەرەبییەکان دەیاننێرن بۆئەوڵاتانەی ڕۆژهەڵاتناسییان تێدا دەخوێندرێت لە ئەوروپاوئەمریکادا، چونکە ئەو شاندو نێردانە، کاتێك دەگەڕێنەوە بارکراون وهەڵگری

بیروباوەڕی لاواز وخراپ و بۆگەنن ، لێرەوە تیۆری ڕۆژهەڵاتناسە دڵ پڕ لەقینەکانی دژ بە ئیسلام تەشەنە دەکەن ودزەدەکەنە ناو هۆڵی وانەوتنەوەی زانکۆ عەرەبی و ئیسلامییەکان و کاردەکەنە سەرگۆڕینی عەقڵ ودڵەکان .

زانکۆی ئەزهەر ژیروهوشیاربوو، لەمەترسی ناردنی ئەوشاندو نێردراوانە تێگەیشت، بۆیە دوورکەوتەوە، لەناردنی شاند ونێردە بۆ زانکۆ و قوتابخانەکانی ڕۆژهەڵاتناسی لەئەورپا و ئەمریکا دا، بۆ خۆپارستن لەشەڕ و زیانیان، بەلایەنی کەم، واپێویست دەکات لەسەر وڵاتە ئیسلامییەکان هەڵنەستن بەناردنی شاندو نێردراوی زانستی، تەنیا پاش ئەوەی عەقڵیان تێردەکەن بەبیروباوەڕی ڕاست ودروست ودڵنیابوون لەعەقیدە و بیروباوەڕیان، لەم کاتەدا بواریۆ تەشەنەکردن ودزەکردنی بیروباوەڕ و بۆچوونی ڕۆژهەڵاتناسەکان نامینێتەوە.[1]

لەکۆتاییدا وتەیەکی ڕاست ئاراستەی سەریازەکانی بەگاورکردن وموژدەدەرەکان دەکەین ئەویش ئەوەیە : لەنێوان خوای پەروەردگار(الله)ولەنێوان هیچ یەکێك لەبەندەکانیدا، پەیوەندی خزمایەتی ونزیکی نییە، گەورەیی و مەزنی بۆ خوای پەروەرگار(الله) گەورەیی یەك شایانی خوای پەروەردگار بێت خەڵك هەموو بەندەی خوای پەروەردگارن، بەڵام خوای پەروەردگار چەند فەرمانێك وچەند نەهی کردنێکی هەیە، بەگوێرەی ئەندازەی شوێنکەوتن وجێبەجێ کردنی بەندە بۆ ئەو فەرمانانە

[1] التبشير والا ستشراق، د. محمد عزت، ص ٣٦٣

وبووركەوتنــەوە لەونــەهی كردنانــە، پشــك وبەشــی خــۆی دەبێــت لــە تــەقواوپارێزكاری، بــەگوێرەی ئەنــدازەی تــەقواو پارێزكــاری بەنــدە پشــك وبەشی دەبێت، لە قەدروورێزگرتن وپشتگیری خــوایی، ســەركەوتنیش هــەر لەلایەن خواوەیــە، بــە هــەر كێــی بیــەوێت دەیبەخشــێت، بــەپێی دانــایی و كــارزانی خــۆی، دانــایی وكــارزانی خــوای پــەروەردگاریش فــەرمان بەسەركەوتنی موسڵمانان دەكات، هەروەك لە قورئانی پیرۆز فەرموویەتی:

﴿ وكان حقاً علينا نصر المؤمنين﴾(سورەتی الروم :ئایەتی –٤٧)

واتــە : ﴿بەراســتی حــەق بووبەســەرمانەوە،حەقە بەســەرمانەوە یارمەتیدان وسەرخستنی بڕواداران ﴾

## سەرچاوەکان

١ – أجنحة المكر الثلاثة،د.عبدالرحمن حسن حبنكه.

٢ –التبشير والاستشراق، محمد عزت.

٣– الغزو الفكري،د.علي عبدالحليم محمود وزملائه.

٤ – التبشير والاستعمار، د.مصطفى خالدي،د.عمر فروخ.

٥– الاستشراق والمستشرقون،د.مصطفى السباعي.

٦ –الاسلام في اندونيسيا،محمد ضياء شهاب.

٧ – لمحات في الثقافة الاسلامية،عمر عودة الخطيب.

٨– حقائق عن التبشير،عماد شرف.

٩– حصوننا مهدده من داخلها،د.محمد محمد حسين.

١٠– معاول الهدم والتدمير في النصرانية والتبشير.

١١– الشيوعية خلاصة كل ضروب الكفر، أحمد عبدالغفور عطار.

## ناوەڕۆك

